# قەڵغانەکان

ناوی نووسەر: أحمد السيد
وەرگێڕانی : ڕێکخراوی ئاستانە
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٠
تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (     ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

# قەڵغانەکان

## چۆن لەگەڵ گومانە هزرییە هاوچەرخەکاندا مامەڵە بکەین

نووسینی

**أحــمد السـيد**

وەرگێڕانی

**ڕێکخـراوی ئاسـتانە**



# پێشـەکی

لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، جەنگەکان بەشێکی دیار و بەرچاویان داگیرکردووەو پشکێکی گەورەی ئەو مێژووەیان بۆ خۆیان پچڕیوە، ئەو جەنگانەش، سروشتی مرۆیی و بەهای هێز و زبریی لای مرۆڤ دەخەنەڕوو، ئەگەر هەندێك، یاخود زۆربەی جەنگەکان، دەربڕیی پەستیی مرۆڤ و حەزی چێنراوی ستەم لە مرۆڤدا بن، ئەوا دەکرێت هەندێك لەو جەنگانە، وەك پێویستییەکی دادپەروارەنە تەماشا بکرێن.

ئەگەر بمانەوێت دیاردەی جەنگ شرۆڤە بکەین، دەکرێت تێبینی ئەوە بکەین کە لەسەر دوو پایەی بنەڕەتیی وەستاوە: هێرش و بەرگریی، پاشان مرۆڤ لە هەردوو بارەکەدا پێویستیی بە ئامرازەکانی جەنگ هەیە، بۆیە مرۆڤ بۆ هێرشبردن کۆمەڵێك چەکی بەکارهێناوەو بۆ بەرگریکردنیش کۆمەڵێك چەکی دی، بۆ هێرشکردن شمشێر و تیر و رمی دروست کرد، بۆ بەرگریکردنیش قەڵغان.

بە وردی نازانین مرۆڤ لە کەیەوە ئاسنی لەناو جەنگدا وەك بەرگریی بەکارهێناوە، بەڵام دەزانین کە پێش پێغەمبەر داوود (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو پێناوە بەرگرییانە بە چەشنێکی گونجاو بۆ سروشتی جەنگ و بگرە و بەردەی جەنگ بەردەست نەبون، چونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەو بەخششەمان بۆ باس دەکات کە پێغەمبەر داوودی فێری ئەو پیشەیە کردووە، وەك دەفەرموێت (وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ)،[1] (وە فێری قەڵغان دروستکردنمان کرد بۆ ئەوەی لەکاتی جەنگدا خۆتانی پێ بپارێزن لە دوژمنتان، ئایا ئێوە شوکرانەی ئەو نیعمەتە زۆرانەی خوا ناکەن؟).

لێرەدا مەبەست بە (لەبووس) قەڵغانە، ئامانجەکەش لێی خۆپاراستنە لە گورز و جەنگ، لە سووڕەتی سەبەئیشدا دەبینین خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر

---

(١) - الأنبياء: ٨٠.

داوود کردووە بە جوانی کاربکات لە قەڵغانسازیدا، پێی دەفەرموێت (أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ)،[١] (قەڵغانی درێژ و فراوان دروست بکە و بزمار و زنجیرەکانی تەقدیر بکە بە ئەندازەی خۆیان).

راڤەکارانی قورئان سەبارەت بە واتای ئەم ئایەتە قسەیان کردووەو چەندین راوبۆچوونیان لەبارەوە هێناوە، کۆی ئەوانەش ئاماژەن بە شێوازی کارکردن لە ئەڵقەکانی قەڵغان، یان بزمارەکانی ئەو ئەڵقانەدا، بە چەشنێك وابکەن قەڵغانەکە زۆر پتەو و یەکانگیر بێت و هیچ کون و کەلەبەرێکی نەبێت و بۆ ئەوە بشێت مرۆڤ بۆ خۆپاراستن و بەرگریی بەکاریبهێنێتن هاوکات قورسیش نەبێت.

ئەگەر زیاتر باسی ململانێی مرۆیی بکەین، دەبینین تەنها لە جەنگی شمشێر و تیر و رم و چەکی ئاگریندا سنووردار نەبووە، بەڵکو چەند مەیدانی دیکەی ململانێ هەن، پێناوەکانی جەنگەکە زمان و پێنووسن، ئامانجەکانیشی ئەگەر شەرەفمەندانە بن، سەرکەوتنە بەسەر بەرامبەردا لە رێی بەڵگەوە، ئەگەریش جەنگێکی پیس و نارەوا بێت، دارماندنی بەها و ناوبانگ و بیروباوەڕی بەرامبەرە لە رێی شێواندن و درۆ بۆ هەڵبەستنەوە.

کاتێك لاپەڕەکانی چەند قۆناغێکی دووروودرێژی مێژوو هەڵدەدەینەوە هەتا لە گرنگترین لاپەڕەی مێژوودا بوەستین، لە لاپەڕەی دەستپێکی گەورەترین رێڕەوی سەرزەویدا دەوەستین، ئەویش ناردنی پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەبینین دوژمنەکانی دوو جۆر جەنگیان لە دژ بەرپاکرد: جەنگی گوفتاری و جەنگی هەستپێکراو (جەستەیی)، پێغەمبەریش ﷺ لە بەرامبەر هێرشەکانیاندا، دوو جۆر بەرگریی گرتەبەر: جەنگی بەڵگە و روونکردنەوە، جەنگی رم و شمشێر، خوای گەورە لە سەرەتادا فەرمانی پێکرد بە قورئانی پیرۆز جیهادی گەورەی بێباوەڕان بکات، وەك دەفەرموێت (فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا)،[٢] (گوێڕایەڵی بێباوەڕان مەبە و بەو قورئانە، جیهادێکی گەورەی کافران بکە)، خوای گەورە

---

(١) - سبأ: ١١.

(٢) - الفرقان: ٥٢.

خۆی وەڵامدانەوەی هێرش و گومانی بێباوەڕان و ئەهلی کیتابی بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتەخۆ، وەك دەفەرموێت ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾،[1] (کافران هیچ نموونە، یان گومانێك بۆ تۆ ناهێننەوە، ئیلا ئێمە لەبەرامبەر ئەو باتڵەی ئەواندا، حەقت بۆ دێنینەوەو باشترین ڕوونکردنەوەت بۆ دێنین)، پێغەمبەری خوایش ﷺ مشتومڕی لەگەڵ دەکردن و وەڵامی دەدانەوە.

زانایانی موسڵمانیش بەرامبەر بە هەر جەنگێکی گوفتاریی دژ بە ئیسلام هەوڵی خۆیان داوەو لەگەڵ وروژێنەرانی ئەو جەنگ و گومانانەدا، مشتومڕی خۆیان کردووەو ڕەخنەیان لە بەڵگەکانیان گرتووەو بە عەقڵ و دەقیش بەڵگەی حەقیان خستۆتەڕوو و نادروستیی ئەو هێرش و گومانانەیان نیشانداوەو پایەیان لەبن هێناوە و بەڵگەی دروستیی و جوانی ئیسلام و گونجاوی ئەو دینەیان بۆ هەموو سەردەمێك خستۆتەڕوو.

هەتا ئێستایش گومانەکان بەرامبەر بە قورئان و پێغەمبەری ئیسلام و شەریعەتی خوا دەوروژێنرێن، ئەوەی ئەمڕۆ چاوی لە باوبۆران و شەپۆلە سەختەکانی دەریا و هەورە ڕەش و چڕوپڕەکانی ئاسمانە و دەبینێت دەریای گومانەکان، بە شەپۆلی بەرزی گومانسازیی شەپۆل دەدات، شەپۆلێك کە کاریگەرییەکەی گەیشتۆتە ئەو کەشتیانەش کە لە بەندەرەکاندا وەستاون، هەندێك لە کەشتیەکان بەیەکدا دەدەن و خەریکە ژێرئاو دەکەون، هەندێکی دیکەشیان بەهێز ماونەتەوەو ئارامیی و سەقامگیرییان ڕوولەزیادبوون دەکات، گوریسی هەندێکیان پچڕاوەو دەریا دوور لە ستەم قووتیان دەدات.

ئەم شەپۆلانەش، کشانێکی نوێی ئەو جەنگە گوفتاریانەن کە هەرکەس بە قەڵغان خۆی بپارێزێت لێیان، ڕزگاری بووە، هەرکەسیش قەڵغانەکەی ورد و چڕ نەچنیبێت، تیرێك بەر قەڵغانەکەی دەکەوێت و لە درز و کەلێنێکەوە، قەڵغانەکە دەبڕێت و کەسەکە دەپێکێت.

---

(١) - الفرقان: ٣٣.

لەم پێشەکییەی باسم کرد، مەبەستم ئەوەبوو ببێتە دەروازەیەك بۆ روونکردنەوەی ئامانجی نووسینی ئەم کتێبە، ئەویش بەشداریکردنە لە چنینی چەند قەڵغانێکی پتەوی هزریی، قەڵغانێك کە ئاسان هەڵبگیرێت و پشتیوان بە خوا، پارێزەرێك بێت لە ئاست ئەو شەپۆلە گومانسازییە هاوچەرخەی ئاڕاستەی ئیسلام و پایەکانی کراوە.

لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەم وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە:

ئەو هۆکارانە چی بوون کە بوونە هۆی ئەوەی گەنجانمان لە کۆمەڵگە ناوچەییەکانماندا روو لە ئیلحاد بکەن، یان هەرچەندە هێشتا وابەستەن بە بنەڕەتی ئیسلامەوە، کەچی نکووڵیی بکەن لە هەندێك بنەمای چەسپاویی شەرعی؟ ئایا گوتاری ئایینی رۆڵی هەبووە لەم لادانەدا؟

مەشخەڵ و مۆرك و تایبەتمەندیەکانی شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخ کامانەن؟ سورشتی کاریگەرییان کامەیە؟

ئایا ئەو پرسیارانەی کە ئەم شەپۆلە دروستیان دەکات، سنووردارن یان لە ژماردن نایەن؟

گرنگترین ئەو پرسیارانە چین؟ چۆن وەڵامیان بدەینەوە؟

رێگەکانی پاراستنی نەوەی نوێ لە دەست زیان و نەرێنیەکانی ئەو شەپۆلە چین؟ چۆن بیانپارێزین بێ ئەوەی دەرگایان لەسەر دابخەین، یان دید و روانین و بیرکردنەوەیان لێ داماڵین.

ئایا دەکرێت چەند پێناوێکی مەنهەجییان پێ بدرێت هەتا بتوانن بەکاریان بهێنن بەرامبەر ئەو بیرو روانینە نەیارانەی ئیسلام کە بۆیان دەخرێنەڕوو؟

چۆن ئەو کەسانە بدوێنین کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بەشێك لەو کێشە و گومانانەوە؟

هەوڵمداوە لە زۆربەی باسەکاندا، بۆ زانیاری زیاتر و سوودی زۆرتر، چەند سەرچاوەیەك زەق بکەمەوە.

ناوەڕۆکی ئەم کتێبەش، لە بنەڕەتدا چەند خولێك بووە کە لەژێر ناونیشانی (چۆن لەگەڵ گومانە هزرییە هاوچەرخەکاندا مامەڵە بکەین) پێشکەشم کردون، هاوکات بڕێك کەم و زیاد و داڕشتنەوەی نوێم بۆ کردووە.

ئەحمەد یووسف سەیید
مەدینەی مونەووەرە
١٤٣٧/١/١ کۆچی

## مەشخەڵ و مۆرك و تایبەتمەندیەکانی شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخ و سروشتی کاریگەربوون پێی

کاتێك پزیشکەکان پێکوتێك - ڤاکسینێك - بەرهەم دێنن بۆ بەرگریی بەرامبەر بە دەردێکی دیاریکراو، پێش ئەوە چەند هەنگاویان ناوە بۆ دیاریکردنی سروشت و راستیی و هۆکارەکانی دەردەکە، بۆ بابەتە هزریی و دیاردە کۆمەڵایەتییەکانیش بە هەمان شێوەیە، چارەسەری هەر کێشەیەك باش دەرناچێت ئەگەر کەسی چارەسەرساز بە وردی ئاگاداری راستی و سروشت و هۆکارەکانی کێشەکە نەبێت.

وێڕای ئەوەی مەبەستی گەورەی ئەم کتێبە بریتیە لە روونکردنەوەی رێبازی خۆپاراستن و چارەسەر بۆ گومانە هزرییەکان و نیشاندانی دیارترین پرسیار و ناڕوونییەکان و وەڵامدانەوەیان، بەڵام باشترە لە سەرەتادا شەپۆلە گومانسازییە هاوچەرخەکە بخرێتەڕوو و مۆرك و تایبەتمەندییەکانی بخرێنەڕوو، ئینجا هۆکارەکانی کاریگەربوون بەو شەپۆلە باس بکرێن، پاش ئەمانە، پشتیوان بەخوا، بچینە سەر ئامانج و مەبەستەکەمان.

### مەشخەڵ و مۆرک و تایبەتمەندیەکانی شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخ:

**یەکەم:** بە زۆریی ئەم شەپۆلە وێرانکەرە نەوەك بنیادنەر، گێرەشێوێنیە نەوەك مەنهەجی، گرفت دەنێتەوەو نارەزاییەکان زەق دەکاتەوە، دواتریش دیدێك یان بیرۆکەی بەدیلی یەکانگیر ناخاتەڕوو، ئەمەش لە چەند وێنەیەکی جیاوازی واقیعی و راستەقینەدا دەردەکەوێت، لەوانەش:

ئەو کەسەی تەماشای پێشنیاری خستنەڕووی ئیلحادیی دەکات، لە زۆربەی پێشنیارەکاندا دوورکەوتنەوەیەك لە دارشتنەوەی بیرۆکەی ئیلحادی بنەڕەتیی بەدیدەکات، ئەو بیرۆکە بنەڕەتییەی کە بریتییە لە نکوولیکردن لە بوونی خوای

بەدیهێنەر، بەڵکو دەبینێت زۆربەی گرنگیدانیان بۆ رەخنەگرتنە لە ئایین - بەتایبەتیش ئیسلام-، لەکاتێکدا لە کرۆکی خودی بیرۆکەی ئیلحادیدا، کەلێنی زۆر گەورە هەیە، کەچی پشتی لێ هەڵدەکەن و خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە راستەقینانەی رووبەڕووی بیروباوەڕیان دەبێتەوە، بەڵکو ئەو دەمەی گاڵتە بە فەرموودەکەی (میزی وشتر) دەکەن، یان باسی تەمەنی عائیشە لە هاوسەرگیریدا، لەم کاتانەدا دەنگیان بەرز دەکەنەوە، ئەگەر هەنگاوێکیش بەرزتر هەڵنێن، باسی سزای کەسی هەڵگەڕاوەو رەجم دەکەن، لێرەوە مۆرکی پشێوی و وێرانکاریی لە بەرامبەر رێکخستن و بنیاددا بە زەقی دەردەکەوێت.

ئێستا وێنەی ریتشارد داوکینزی گەورەی مولحیدەکانم دێتەیاد کاتێك لە دیدارێکی کەناڵی جەزیرەدا - کە لە ماڵپەری کەناڵەکە دانرابوو- پرسیار لە مەهدی حەسەن دەکات و دەڵێت: ئایا بڕوای بەوە هەیە موحەممەد بە ئەسپێکی باڵدار سەرکەوتووە بەرەو ئاسمان؟ شێوازی گاڵتەئامێزانەی پرسیارەکەی، سەرسامیی لای جەماوەرەکەی دروستکرد و چەپڵەیان بۆ لێدا، لەکاتێکدا لە بەرنامەیەکی دیکەدا سەبارەت بە بنەڕەتێکی بیرۆکە ئیلحادییەکەی پرسیارێکی لێکرا کە ئەویش بنەڕەتی پەیدابوونی ژیانە، کەچی وەڵامەکەی هیوابڕانێك بوو بۆ مولحیدان و دیمەنی لاوازی ئەو کەسەی نیشان دەدا، باسی لەوە ئەکرد کە لەوانەیە لە کاتێکدا، یان لە شوێنێکی گەردووندا، شارستانیەتێك لەسەر شێوازی داروینی پەرەی سەندبێت و شێوەیەك لە شێوەکانی ژیانی کێشابێت، لەوانەشە لەم گەردوون و بوونەماندا چاندبێتیان.

هەروەها کاتێك سەبارەت بە سەرهەڵدانی گەردوون لەسەر چەند یاسایەکی ورد لەگەڵ ستیڤن واینبۆرگی فیزیاناسی مولحیددا قسەی دەکرد و باسی لەو ئەگەرە کرد کە ئەکرێت بەهۆی بوونی چەند گەردوونێکی جیاجیاوە ئەم گەردوونەی ئێمە سەریهەڵدابێت، وەڵامی ئەویش ئەوەبوو کە ئەگەر وابێت، وادەخوازێت ژمارەی گەردوونەکانی دیکە لەنێو دە بۆ سەدو و بیست گەردووندا بووبن، پاشان پێی وت: لەراستیدا ئەمەش شتێکی بێزارکەرە.

بەم چەشنە دەبینیت، پرسە گەورەکان لای هەڵگرانی بیری ئیلحادیی، شێواون و لەسەر بنیادێك دانەمەزراون، لەبری ئەوەی بەڵگە بهێننەوە بۆ راستی بیرۆکەکەی خۆیان، خوویان داوەتە شکاندن و هەوڵی لەناوبردن و تانەدان لە ئایینەکان.

وێنەیەکی دیکەی پێشنیاری وێرانکارانەی نامەنهەجیی، بریتیە لە پڕۆژەکەی دکتۆر عەدنان ئیبراهیم کە لەم ساڵانەی دواییدا، بەهۆی ئەو گرتە ڤیدیۆییانەوە کە وتار و بیروبۆچوونەکانی بڵاو دەکەنەوە، لە هەموو پڕۆژەکانی تر کاریگەری زیاتر بووە، ئەگەرچی هەندێك کەس لەرووی ئیمانی یان مەعریفیەوە سوودیان لێوەرگرتبن، بەڵام هێندەی ئەو بارگرژییە مەنهەجییە دەخاتەڕوو کە خۆی پیادەی دەکات و دواتر دەیگوازێتەوە بۆ جەماوەرەکەی، هێندە دیدێکی مەعریفیی بنیادنەری یەکانگیر پێشکەش ناکات، ئەو کەسەی گوێی لێدەگرێت، بەرامبەر بە ژمارەیەك پرسی گرنگیی شەرعیەوە کە قسەی زۆریان لەبارەوە دەکرێت، بە بڕیارێکی روونەوە لە بابەتەکە ناچێتە دەرەوە، بۆ نموونە هەڵوێست بەرامبەر بە کتێبەکانی فەرمووده، جارێك دەیبینیت گەورەییەکی زۆر نیشان دەدات بۆ کتێبە صەحیحەکانی فەرموودە، وەك صەحیحی بوخاری، ئەمە ئەو کاتەی فەرموودەیەکی تێدا بێت کە لە بازنەی پاڵپشتیی بیروبۆچوونیدا بێت و وەك بەڵگە بەکاریبهێنێت، کەچی لە شوێنێکی تردا سەبارەت بە صەحیحی بوخاری کە پالپشتیی راوبۆچوونەکەی نەکات، دادەبارێتە سەر ئەو کتێبە و نووسەرەکەی و بڕێك دەستەواژەی زبری نکوولّیی و دڕندەیی و بێزراویی بەرامبەر بەکاردەهێنێت کە وات بۆ وێنا دەکات بوخاری حەڵوا فرۆش یان شوانێك بووە نەوەك زانایەکی کارامەی کەموێنەی ناو مێژوو.

زۆرجار گوێگر بێ ئەوەی کلیلی مەنهەجیی بەدەستەوە بێت، بەبێ رەچاوکردنی هونەر و رەوشتی راجیایی، دەست دەبات بۆ پرسە چەسپاو و بێ چەنوچونەکان، هەیانە لەسەر بنەمای دیدگای مەعریفیی و هزریی خۆی —کە پێی وایە عەقڵی صەریحە- مامەڵە لەگەڵ دەقەکاندا دەکات، ئیتر هەر دەقێك بۆ تێگەشیتنی خۆی گونجاو بێت، وەریدەگرێت، هەر دەقێکیش بۆ تێشگەیشتنی خۆی بە گونجاو نەبینێت، بەرپەرچی دەداتەوە.

ASTANA

دژایەتیکردنی نوێگەرایی و رازیبوون بەم واقیعە زانستیەی کە تیایدا دەژین، پاڵنەری ئەم قسانەم نەبووە، بەڵکو نکوولّییە لەو نوێگەرییەی کە لەسەر بنەمای پشێویی مەنهەجیی و شۆڕشی هەڵوەشێنەر و وێرانکاریی دامەزراوە، نەوەك لەسەر بنەمای دیدێکی بنیادنەر، یان رەخنەیەکی دادپەروەرانەی مەنهەجیی، چونکە ئەو پشێوییە دەروازەیەك نیە بۆ دەرچوون لەم دواکەوتنەی کە لە بوارەکانی زانست و مەعریفە و بیرکردنەوەدا تێیکەوتوین، بەڵکو ئەو دواکەوتنە خەستتر و ئاڵۆزتر دەکات.

تەماشای ئەو نموونانەم کردووە کە خەڵکانێك وازیان لە ئیسلام هێناوە، راشکاوانە دەڵێن یەکەم: هەنگاوی ئەو داکەوتنەیان گوێگرتن بووە لە عەدنان ئیبراهیم،[١] دواتر دادەبەزن بۆ لای (شەحروور)،[٢] دواتر داڕووخان رووەو مەزهەبی ربووبیی[٣] یان ئیلحاد، پێم وانیە ئەمە ئەنجامی ئەو نوێگەرییە بێت کە ئێمە هەوڵی بۆ دەدەین.

**دووەم:** ئەم شەپۆلە پرسیارگەلێکی زۆری بێسنووری لەخۆگرتووە، پرسیارێك نیە کە لای ئەوان هێڵی سوور بێت و خۆیانی لێ نەدەن، ئیتر پرسیارەکە پەیوەست بێت بە خوای گەورەوە، یان بە کرداری خواوە، یاخود بە تەشریعاتی ئیسلامی، یان بە پێغەمبەران، یاخود بە مەسەلە فەلسەفییەکانی پەیوەست بە ئەزەلییەت یان نوێبوون و دروستبوونی گەردوونەوە، ئەمەش وا ئەخوازێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ

---

(١) - پاش ساڵێك لە نووسینی ئەم چەند دێڕەی کتێبەکەم لە چاپی یەکەم و دووەمدا، وا لەم چاپەشدا بەرچاوروونی زیاترم لەسەر ئەم دێڕە پەیداکردووە و چەندین نموونەی تر م دیوە کە هۆکاری بوون بە مولحیدییان، لە سەرەتاوە گوێگرتن بووە لە عەدنان ئیبراهیم، ئەمەش وەك شایەتییەك دەنووسم نەوەك شرۆڤە و راوبۆچوونێك بێت و بەس.

(٢) - یەکێکە لە رێبەرانی نکوولّیکردن لە فەرمووده و شێوێنەرانی -واتای- قورئان.

(٣) - ربووبیەت رێڕەوێکی لادەرە کە پێی وایە خوایەك ئەم گەردوونەی بەدیهێناوە، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی سروش و پەیام لەنێوان خوا و گەردووندا نیە، بەم چەشنە خوای گەورە هیچ پەیام و دەستوەردانێکی نیە بۆ ژیانی ئادەمیزاد، هەر پەیوەندیەکی نێوان خوا و مرۆڤەکانیش، تەنها پشت بە عەقڵ دەبەستێت. وەرگێڕ.

ئەم پرسیارانە، کەسانی پسپۆڕ لە رووی دەروونی و مەعریفیشەوە ئامادەسازیەکی باش بکەن.

**سێیەم:** شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخ کۆمەڵێك دروشمی گشتیی بریقەدار و سەرنجڕاکێشی هەڵگرتووە کە مەشخەڵەکانی دیاریکراو نین و بە مەنهەجێکی زانستیی وا نەچنراون کە هەڵگرەکەی لە پشێویی یاخود ناتەبایی بپارێزێت، لە دیاترینی ئەو دورشمانەش بریتین لە (ئازادکردنی عەقڵ، رەخنەگرتن لەوەی لە پێشینانەوە بۆمان ماوەتەوە، رازینەبوون بە سەرپەرشتیاریی باوك بۆ کچ، ئازادی) و ئەم جۆرە دەستەواژانە، ئەم دروشمانە تەواو نارەوا نین، بەڵکو پێویستیان بەوەیە روونبکرێنەوە چی و چی لەخۆدەگرن و ئەو ئامانجە هەڵە و نادروستانەی لێ جیابکرێنەوە کە کەسانێك دایانناون کە لەو رێگەوە گومان دەخەنە سەر ئیسلام و بنەما جێگیرەکانی، واتا راست و دروستەکان لەو ئامانجە خراپانە جیابکرێنەوە، هەتا ئارەزووبازان نەتوانن لە ئەرزی واقیعدا جێبەجێیان بکەن، بۆ نموونە کەسانێك هەن لەژێر بانگەشەی (رەخنە لەوەی لە پێشینانمان بۆمان جێماوە) نکوولیی لە هەموو سوننەت دەکەن، ئەم بەکارهێنانە خراپە، ئەنجامی ئەو هەموو دروشمە و جلەوگرتنی دابەزاندنی ئەو دروشمانەیە لەناو کۆمەڵگەدا.

**چوارەم:** کاریگەربوون بەو شەپۆلە لە کۆمەڵگەی ناوچەیی خۆماندا لەنێوان خۆشاردنەوەو خۆئاشکراکردندا خۆی هێشتۆتەوە، زیاتریش لە خۆشاردنەوەوە نزیکە،[1] بۆیە پێوانەکردنی قەبارەی ئەو دەستەو توێژەی کە کاریگەرن بەم شەپۆلە، قورسییەکی تێدایە، لە هەمانکاتدا ئەم خۆشاردنەوەیە باوکان و دایکان و پەروەرشیاران راڕا دەکات.

**پێنجەم:** گەورەترین مەیدان بۆ پەخشکردنی گومانەکانی ئەم شەپۆلە و وەرگرتنیان و کاریگەربوون پێیان، -هەتا ئێستا- بریتیە لە تۆڕەکانی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، ئەمەش رەهەندێکی فراوانخوازیی گەورەیناملکەچ بۆ بەربەستە کۆمکارە

---

(١) - بە لایەنی کەمەوە هەتا نووسینی ئەم چەند دێرە، بارودۆخەکە وایە، دەشکرێت بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و پێشهات و کارتێکەرەکان بگۆڕێت.

بەردەستەکانی لێ بەرهەم دێت، مەبەستم بە بەربەستە کۆمکارە بەردەستەکان بریتیە لە (مزگەوت، خوێندنگە، خێزان)، کەسانێك کە هاتوچۆی مزگەوت دەکەن، دەکرێت بکەونە بەر کاریگەریی ئەم شەپۆلە، دەکرێت ئەو کەسەی لە کۆشی دایك و باوکێکی چاکدا دەژی، کاریگەریی ئەم شەپۆلەی لەسەر بێت، کاتێك لەگەڵ ژمارەیەك لەو کەسانە گفتگۆم کردووە کە کەوتوونەتە بەر ئەو کاریگەرییە، تێبینی ئەم حاڵەتەم کردووە، لەوانە: ئافرەتێك پەیوەندیی کرد و باسی ئەوەی دەکرد کە راشکاوانە بڕوای بە ئیسلام نەماوە، لەسەر هەندێك پرس و بابەت کەوتە مشتومڕکردن، لەناکاو پەیوەندییەکەی پچڕاند، دواتر کە پەیوەندیی کردەوە، پۆزشی بەوە هێنایەوە کە باوکی کەسێکی دیندارە و ترساوە باوکی گوێی لە قسەکانی بێت، بەو هۆیەوە پەیوەندییەکەی پچڕاندووە.

**شەشەم:** مەترسیی ئەم شەپۆلە لەوەدایە کە ئاڕاستەکەی دژ بە ئیسلام و ئەو بنەڕەتانەی شەریعەتە کە یەکدەنگییان لەسەرە، خۆ ئەگەر رەخنە و گلەییەکە بۆ نموونە ئاڕاستەی خوێندنگەیەکی شەرعیی بکرایەتەوە، یان دژ بە زانایەك لە زانایانی موسڵمانان بوایە و دەست نەبرایە بۆ بنەڕەت و خاڵە چەسپاوەکانی ئیسلام، ئەوە مەسەلەکە زۆر لەمەی ئێستا هێور و ساکارتر دەبوو، ئەگەر تەماشای ئەو کەسانە بکەین کە پێی کاریگەر بون، ئینجا دیوی مەترسیەکەمان بۆ دەردەکەوێت، کاتێك دەبینیت یەکێکیان بنەڕەتەکانی ئیسلام لەدەست دەدات، ئەمە کوفرێکە کە بەرەو دۆزەخی دەبات، وەك چۆن لەدەستدانی بنچینە و بنەڕەتە شەرعییەکان، لەدەستدانی پێناس و تێکچوونی ئاماژەی ئاڕاستە و لێکهەڵوەشانی ئەرکەکانە، بەڵکو نکووڵیکردن لە هەندێ بنچینە و بنەڕەت، کوفرە، هەموو ئەمانە بابەتەکە لە ئاستێکدا وێنا دەکات کە خۆلێگێلکردن و خۆبێئاگاکردن و بەکەم تەماشاکردن هەڵنەگرێت.

لە بابەتی شەشەم و حەوتەمی ئەم کتێبەدا دیارترین ئەو گومانانە شیدەکەمەوە کە ئەم شەپۆلە لەخۆیان دەگرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ورد و درشت، درك بە مەترسیەکانی ئەم چەشنە شەپۆلە بکەین.

**حەوتەم:** ئەوەی مەترسیی ئەم شەپۆلە زیاتر دەکات، ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانەی پێی کاریگەرن، توێژی گەنجانن لە هەردوو رەگەزی نێر و مێ، ئەمەش واتە دەرکەوتنی تەواوەتی شوێنەوارە خراپەکانی، لە داهاتوویەکی نزیکدا دەبێت، کاتێك ئەو گەنجانە دەگەنە قۆناغی بەخشین و کردار و پەروەردەو رێنموونیی-ئەمە ئەگەرهۆشیارانە لەو ئاستەدا مامەڵە نەکرێت کە دۆخەکە دەیخوازێت-.

**هەشتەم:** ئەوانەی کاریگەر بون بە شەپۆلی گومانەکانی سەردەم، دابەش دەبن بۆ دوو بەش:

**أ:** ئەو هەرچی و شێوێنەرانەی کە لەنێو ئەو گومانانەدا، بەدوای ئارەزووە کەسێتییەکانی خۆیانەوەن، ئەمانەش زۆرن.

**ب:** ئەوانەی لەژێر کاریگەرییەکی راستەقینەی هزرییدان و ئەو کاریگەرییە وای لێکردون دەست بدەنە برێك هزر و بیری نوێ کە لادانی شەرعییان تێدایە.

ئەمە وامان لێدەکات بەشێوەیەکی گشتگیر بڕیار نەدەین و تۆمەتی گشتیی نەبەخشینەوە و بەدوای چەند هۆکاری جیاواز و هەمەچەشنەدا بگەڕێین بۆ چارەسەر، بە چەشنێك بەپێی جیاوازیی دۆخ و حاڵەتەکە، شێوازی گونجاو بۆ هەرکامیان بگیرێتەبەر.

**نۆیەم:** ئامانجی هەریەك لەوانەی گومانەکانی سەردەم دەوروژێنن، جیاوازە، هەیانە مەبەستی ئەوەیە خەڵك لە ئیسلام دووربخاتەوەو لەو ئایینە بیانباتە دەرەوە، بەڵکو هەیانە مەبەستی ئەوەیە خەڵکی لە هەموو ئایینێك دووربخاتەوە، ئەمەش وێنا دەکرێت لەلایەن مولحیدە نوێکان و ربووبییەکان و ئەو کەسانەی کە لە رووی سیاسییەوە سوودمەند دەبن، لە لەناوچوونی هێزی موسڵمانان و تەفروتونابوونی قەوارەکەیان.

هەندێکی دی لە گومانسازان مەبەستیان ئەوە نیە ئیسلام وێران بکەن و بنیادی ئەم ئایینە داڕووخێنن، بەڵکو هەیانە گومانێکی باشی هەیە، ئەویش جوانکردنی وێنەی ئیسلامە و نیشاندانیەتی بەو چەشنەی کە لەگەڵ حەز و دەروونی سەردەمدا بگونجێت، بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، روودەنێتە نکووڵیکردن لە هەندێ بنچینە و بنەڕەتی شەرعی، یان لێکدانەوەی بە چەشنێك کە سەرنجی

ناموسڵمانانی بۆ رابکێشێت، مەبەستم بە بنچینە و بنەڕەتە شەرعییەکان بریتییە لەو حوکم و گێڕانەوانەی کە ئەهلی سوننەو جەماعە یەکدەنگن لەسەر وەرگرتن و کارپێکردنیان، وەك دانانی سوننەت بە سەرچاوەی تەشریعیی بۆ حوکم و خەبەرە دینییەکان، یان وەك حەددە[١] شەرعییەکان.

**دەیەم:** ئەم شەپۆلە کۆمەڵێك رەخنە و گازندەی لەخۆ گرتووە بەرامبەر بە بوون و کەماڵی خوا و پێغەمبەرایەتی و شەریعەت، زۆرجار دەبینیت خودی ئەو پرسیارانە لەسەر زاری هەمە چەشنەی تەمەن و شار و وڵاتی کەسانی کاریگەر بەو گومانانە، دەوترێنەوە، ئەمەش لە ئەنجامێکی هزریی و بەرەنجامێکی عەقڵییەوە نەبووە هەتا بەو هۆیەوە بەم پرسیار و رەخنانە گەیشتبن، بەڵکو لە دەستاودەست، یان دەماودەمی ئەو زانیاریانەوەیە کە لە سایەی ئەم تۆڕە ئینتەرنێتییەوە هاتۆتەکایە، تۆڕێك کە دوورییەکانی نزیك کردۆتەوەو هەموو جیهانی لەسەر سەکۆیەك کۆکردەوە، لە نێو ئەم کتێبەشدا دەستەیەك لە دیارترینی ئە وپرسیار و رەخنەو گازندانە دەخەمەڕوو کە ئەم شەپۆلە گومانسازییە لەخۆی گرتون، هاوکات چەندین کتێب هەن کە گرنگییان داوە بە باسکردنی دیارترین تەگەرەکان بە گشتیی، یان چەند بوارێکی دیاریکراو، لەوانەش:

مەوسووعەی بیان الإسلام[٢]

کتێبی (تنزيه القرآن الكريم عن دعاوى الطاعنين)

لە دیدی منەوە، لە چاکترین بەرهەمەکانی ئەم بوارە، نامەی دکتۆراکەی سوڵتانولعومەیریە بە ناونیشانی (ظاهرة نقد الدين غي الفلسفة الحديثة).

لە کۆتایی ئەم باسەدا ئاماژە دەدەم بە سەرچاوەیەك کە لە وەسفی ئیلحادی نوێدا سوودبەخشە، ئەویش بریتیە لە کتێبی (میلیشیا الإلحاد)ی عەبدوڵا عوجەیری.

---

(١) - مەبەست بە حەد ئەو سزا دیاریکراوانەی ناو ئیسلامن لە بەرەنجامی تاوانێکی دیاریکراودا کە بە دەقی قورئان و فەرموودە دەستنیشان کراون، وەك دەستبڕینی دز. وەرگێڕ.

(٢) - سوپاس بۆ خوا ئەم مەوسووعەیە لە قۆناغی وەرگێڕاندایە بۆ سەر زمانی کوردی و ناوەندی رێنوێن هەستاون بە چاپکردنی بەرگی یەکەمی. وەرگێڕ.

## چاکەیەکی قەدکراوی نێو شەپۆلی گومانە هزرییە هاوچەرخەکان

بارودۆخەکە هەرچەندە پڕ هەڕەشەش بێت، هێشتا پێم خۆش نیە رەش بین بم، خوای گەورە خراپەیەکی تەواو خراپ و بێ چاکە بەدیناهێنێت، کاتێك دەست دەبەین بۆ بەش و لایەنەکانی ئەم شەپۆلە گومانسازییە و ناوەڕۆك و وردەکارییەکانی ئاشکرا دەکەین، گەشبینیەك روومان تێدەکات کە دەکرێت بەهۆی ئەم شەپۆلەوە خێر و چاکەیەك رووماں تێبکات، بەڵام بەدەستهێنانیشی بەستراوەتەوە بە مەسەلەیەکی گرنگەوە کە پاش باسکردنی دیوەکانی ئەو خێر و چاکەیە، باسی دەکەم:

**یەکەم:** لەوانەیە ئەم شەپۆلە ببێتە هۆی پەرچەکردارێك لای زۆرێك لەوانەی کاریگەر بون بە شەپۆلەکە، یان لای ئەوانەی هەست بە مەترسیەکەی دەکەن، ئەم پەرچەکردارەش بریتیە لە (دووبارە وەرگرتنەوەی ئیسلام بە یەقینەوە نەوەك بە باو و تەقلید)، لەراستیشدا هیچ شتێك لەوە سوودبەخشتر نیە بۆ ئیسلام کە شوێنکەوتەکانی یەقینێکی تەواوەتییان هەبێت بە راستێتی ئیسلام و بەردەوام هەست بە چێژی ئایینەکەیان بکەن، لەوانەیە لە رێی گەیشتن بەم ئامانجە جوانە، قۆناغی تاقیکردنەوە بێت و تیایدا کەسانێك بکەون و خەڵکانێکیش سەرپێ بکەونەوە.

ئەگەر تەماشای حاڵەتی ئیمانی هاوەڵان بکەین، ئەوان پێش ئەوەی ببنە موسڵمان، تالاوی شیرك و کوفر و بێئاگاییان لە سەردەمی نەفامیدا چەشتبوو، پاشان کە خوای گەورە لە دوای درەوشانەوەی رووناکی ئیسلام بە ناردنی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ مۆڵەتی رێنموونیی ئەوانی دا، بەدوای راستیی بانگەوازەکەدا رۆیشتن، لەوێ بۆیان دەرکەوت ئەمە پێغەمبەرایەتیەکی راستگۆیانە و راستەڕێ و رووناکییەکی روونە، بۆیە توند دەستیان پێوەگرت و وێڕای ئەو هەموو ئازارەی

هاتەڕێیان، پێچەسپاوانە راوەستان، پاشان ئەو رووناکییەیان گەیاند بە مرۆڤایەتیی و لەسەر نارەحەتییەکان بەرگەیان گرت و سەختییەکانیان تێپەڕاند، هەموو ئەمەش بەرهەمی وەرگرتنی ئیسلام بوو بە یەقینەوە نەوەك بە تەقلید.

**دووەم:** بڵاوبوونەوەی گیانی لێکۆڵینەوە و گفتگۆ و دیبەیت.

**سێیەم:** سەرپێخستنەوەی گوڕوتینە کوژاوەکان:

زۆرێك لە هەڵگرانی زانستی شەرعیی، ئەو هیوا و ئاواتەیان بەدینەهێناوە کە لێیان چاوەڕوان دەکرا، لە بواری بڵاوکردنەوەی زانست و بەرگریکردن لە ئیسلام و بانگەوازبۆکردنیدا، بەدیبهێنن، بەڵام ئەوەی جێی هیوایە، کاتێك دەبینن رەشەبای گومانەکان بەدەوریاندا هەڵیکردووە، پشکۆی غیرەتیان لە ئاست ئیسلامدا بگەشێتەوەو گوڕوتینیان تێبکەوێتەوە، ئەگەر تەنها ئەمەیان بێتەدی، خۆی بۆ خۆی خێرێکی گەورەیە.

**چوارەم:** بانگخوازان پێداچوونەوە بە شێوەی گەیاندنی بانگەوازەکەیاندا دەکەن، پشتیوان بەخوا لە کاتی قسەکردن لەسەر تایبەتمەندییەکانی گوتاری بانگخوازیی کاریگەر لە مەیدانی هزریی هاوچەرخدا، دووروودرێژتر باسی دەکەین.

ئەم لایەنی چاکانەی لەنێو شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخدا پێچراونەتەوە، بەندن بە ئیجتیهادی هەڵگرانی زانست و ئیمانەوە کە چۆن بە باشترین رێوشوێن و شێواز بەڵگەی حەق بڵاودەکەنەوە، بەڵام ئەگەر دەستیان هەڵگرت لەم تەحەددایە، یان بە کەم تەماشایان کرد و لە ئاست ئەم شەپۆلەدا چارەسەری تایبەت و ژیرانەیان نەگرتەبەر، دەترسم لەپاش کارەساتێکەوە بەهۆش خۆمان بێینەوە کە شوێنەوارە خراپەکانی تەمەنێکی زۆر بکەن.

# هۆکارەکانی کاریگەربوونی نەرێنی
# بە گومانە هزرییە هاوچەرخەکان

زۆرێك لە خەڵك، کاتێك شرۆڤەی کێشەیەك، یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی دەکەن، حەزیان بەوەیە هۆکارەکانی بەهێما و ئاماژە بخەنەڕوو و قەسەیەکی روون نەدەن بە دەستەوەو بەپێی ئەندێشە و گوفتاری ناو کۆڕەکان بڕیاری لەسەر بدەن، کاتێك پرسیارێك دەخرێتەڕوو: بۆچی هەندێك لە گەنجەکانمان دەبنە مولحید؟ یان بۆچی نکوولّیی لە سوننەت دەکەن؟ دەبینیت هەندێك هۆکارەکانی کێشەکە کورت دەکەنەوە لە یەك یان دوو هۆکاردا، ئەمەش راست نیە، مەسەلەکە ئاڵۆزەو چەندین هۆکاری جیاوازی لەخۆگرتووە، بۆیە -پاش رامانم- هەوڵمداوە هۆکارەکانی ئەو کێشەیە کۆبکەمەوە کە بۆم دەرکەوتون، پاشان هاوتاکانیم کۆکردۆتەوەو لەژێر چەند جۆرە کاریگەرییەکدا دابەشکاریم بۆ کردووە کە هەرکام لەو هۆکارانە چەند هۆکارێکی لەخۆگرتووە:

## جۆری یەکەم: کاریگەرییە دەرەکییەکان: بۆ ئەمەش پێنج کاریگەریی باس دەکەم:

### یەکەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان:

لە کەس شاراوە نیە کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان چ بوارێکی خێر و چاکە و مەعریفە و دەستەبەرییەکیان لەخۆگرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا بە گەورەترین هۆکاری خێرا دەستاودەستکردنی گرێ و گومانەکان دادەنرێن و بەشدار بون لە دروستکردنی پردی نێوان سەرچاوەکانی گرێ کۆنەکان و ئەو توێژەی دەکرێت کاریان تێبکرێت، هەروەك ئاسانکارییان کردووە بۆ گومانسازان هەتا بێ هیچ کۆت و بەربەستێك گومانەکانیان بڵاوبکەنەوە و دەرفەتێکی چاکیان داوە بەوانەی خوازیاری ناوبانگ پەیداکردنن، بە خۆجیاکردنەوەو پێچەوانەوە خۆنیشاندان، بەدوای

ناوبانگدا بگەڕێن، ئەمەش لەسەر بنەمای (پێچەوانە بجوولێرەوە، دەناسرێیت)، هەروەها تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وا دەکەن گومانەکان بێ ئەوەی داوای مۆڵەت بکەن، خۆیان بکەن بە ژووردا، ئەمەش مەترسیەکی ترە.

## دووەم: فیلم و ڕۆمانەکان:

زۆر بە کەمی دەبینیت لە راگەیاندنی بینراو، یان لە کتێبە خوێنراوەکاندا، دڵڕاکێشانی هەردوو رەگەزی نێر و مێ، چەشنی فیلم و رۆمانەکان، بوارەکانی دی کاریگەرییەکی وایان هەبێت، بە چەشنێك بازنەی توێژی کاریگەر بە خۆیان فراوانتر دەکەن، کێشەکە لەوەدایە کە زۆرێکیان کاریگەریی ناڕاستەوخۆیان دەبێت، ئەمەش لە رێگەی گواستنەوەی رۆشنبیریی بیانییەوە بە چاك و خراپ و راست و هەڵەیەوە، بێ ئەوەی ئەو بەشانەی جیا بکرێنەوە کە لەگەڵ بەهاکانی ئیسلامدا ناتەبان.

## سێیەم: پەیوەندیی و بەریەککەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ رۆشنبیرییە بیانییەکان لە رێگەی خوێندن و هاوچەشنەکانیەوە:

کێشەیەکی زۆر زەق ئەوەیە کە گەنجی موسڵمانی وا هەیە لەسەر کورسی خوێندن، لەبەردەم مامۆستایانێکی ناموسڵماندا دادەنیشێت، ئەوانیش هەیانە گرنگیی دەدات بە بڵاوکردنەوەی هەندێ بیروڕای ئیلحادی، هەندێ خوێندکار کەوتوونەتە بەر ئەو کاریگەرییە، تەنانەت لەوانەش کە لە خوێندنی باڵادان، ئەگەر ئەو گەنجە پێش ئەوەی بچێت بۆ ئەو خوێندنە، ئاستێکی باڵای ئیمان و یەقینی هەبێت و توانایەکی گونجاوی رەگداکوتانی شەرعی و ئامرازی مەعریفی وای هەبێت کە بتوانێت زانیارییە نوێکانی پێ هەڵبسەنگێنێت و بیانخاتە بەر رەخنەی زانستیی، ئەوە رۆیشتنەکەی ئاسانتر دەبوو و بەدووردەبوو لەو شتانە.

## چوارەم: بڵاوبوونەوەی ئارەزووە حەرامکراوەکان:

ئێمە لە قۆناغێکی تایبەتی مەترسیداردا دەژین کە تەقینەوەی پێناوەکانی لەخشتەبردنی جنسین، جا ئایا هیچ پەیوەندییەك هەیە لەنێوان بڵاوبوونەوەی ئارەزووە حەرامکراوەکان و گونجانی کاریگەربوون بە ئارەزووەکان؟

کێشەی سروشتی ئارەزووەکانی سەردەم ئەوەیە کە لق و پۆپی زۆرە و زنجیرەیین، یەکەمیان پەلکێشت دەکات بۆ دوای خۆی، دەکرێت هەموو سەرنج و هەست و سۆز و بیرکردنەوەی گەنج بۆ لای خۆی رابکێشێت، ئەمە وادەکات هەندێ لەوانەی وابەستەن پێیەوە، ئەرکە شەرعیەکانیان لەسەرشان قورس بێت و بە گران تەماشایان بکەن، پاشان واز لە هەرچییەك بهێنن کە رێگرییان لێ دەکات چێژ لەو ئارەزووانە ببینن، ئەویش ویژدان مراندنە بەرامبەر پەیڕەوکردنی حەرام، رێگەیەکی گەیشتن بەوەش، دەرچوونە لە دین، یان نکووڵیکردنە لە پاداشت و لێپێچینەوە.

لەوانەیە ئەو ریزبەندییەی پێشوو لە رووی واقیعیەوە زۆرینە نەبێت، بەڵام مەترسیدارەو دوور نیە رووبدات.

دیوێکی تریش هەیە کە بریتیە لەوەی ئەنجامدانی تاوانی زۆر و تەوبەنەکردن لێیان، وادەکات (ران)[1] دروست ببێت کە ئەگەر هاتوو لەسەر دڵ کەڵەکە بوو، رێگریی ئەوەی لێ دەکات حەق ببینێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (كَلا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ)،[2] (نەخێر، نابێت وابن، ئەوەی وایلێکردون ئیمان نەهێنن، ئەو تاوان لەسەر تاوانەیە ئەنجامی دەدەن).

ئەگەر بەربەستەکانی سەر دڵیش زۆر بوون، رووناکی ئیمان دادەمرکێتەوە، ئیتر بە بچووکترین گومان، دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە.

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە ترمزی و فەرمووودەناسانی دیکەش لە ئەبووهورەیرەوە (رەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە دەفەرموێت (إنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا، حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ: { كَلا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ })،[3] (بەندە ئەگەر هەڵەیەکی کرد، خاڵێکی رەش لە دڵیدا دادەنرێت، ئەگەر وازی هێنا و تەوبەی کرد و گەڕایەوە لای خوا، دڵی پاك

---

(١) واتای ژەنگ و چڵك دەگەیەنێ.

(٢) - المطففين: ١٤.

(٣) - سنن الترمذي، الرقم ٣٦٦١ و قال حسن صحيح.

دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر تاوانەکەی ئەنجام دایەوە، خاڵێکی دیکەی ڕەشی بۆ زیاد دەکرێت هەتا زاڵ دەبێت بەسەر دڵیدا، ئەمەش ئەو (ران)ەیە کە الله باسی کردووە).

دەبێت بۆ شرۆڤە و شیکاری هەر کێشەیەکی پەیوەست بە دوورکەوتنەوە لە دین، بێئاگا نەبین لەم واتا غەیبیانە و هاوشێوەکانیان کە لە شەرعدا هاتون.

## پێنجەم: پێشکەوتنی ماددیی جیهانی ڕۆژئاوا و کاریگەریی ڕۆشنبیریی خۆرئاوا:

زیجرید هونکەی ژنە نووسەری بەناوبانگی ئەڵمانی، نووسەری کتێبی (شمس الله تشرق علی الغرب) کە لە ساڵی ١٩٦٠ ی زاینیدا ئەو کتێبەی بڵاوکرایەوە، هەروەها کتێبێکی تری نووسیوە بە ناونیشانی (الله ئاوا نیە)، کتێبێکە تیایدا بەرگریی دەکات لە موسڵمانان و مێژوو و شارستانیەتی ئیسلامیی، هەروەها لە هەمان کاتدا، تیایدا دەقێکی ناوازە و گرنگی هێناوە کە تیایدا باس لە هەڵوێستێك دەکات کە تەواو لەو بارودۆخە دەچێت کە ئەمڕۆ موسڵمانان سەرسامن بە شارستانیەتی ڕۆژئاوا، بەڵام ئەوکات بە پێچەوانەوە، قسەکەرەکە قەشەی قورتوبە (ئەلقاروا) یە لەو کاتەی کە شارستانیەتی ئیسلامی باڵا بوو، -بە دەربڕینی نووسەر-[1] بە چەند وشەیەکی کاریگەر کە داخی دڵی وێنا دەکەن، سکاڵای خۆی دەکات و دەڵێت: (زۆرێك لە هاوئایینەکانم ئەفسانەکانی عەرەب دەخوێننەوەو خەریکی نووسینەکانی فەیلەسووف و زانا موسڵمانەکانن، بۆ ئەوە نا کە تێکیانبشکێنن، بەڵکو بۆ ئەوەی بتوانن فێر ببن بە عەرەبی قسە بکەن و لە دەربڕینی دروست و هەووەسی ساغدا پشتی پێ ببەستن، ئەمڕۆ لە کوێ نەصرانیەك بدۆزینەوە جگە لەو تایبەتمەندانەی کە سەرقاڵن بە خوێندنەوەی تەفسیرە لاتینیەکانی ئینجیلەوە؟ بەڵکو کامیان تەنانەت چوار ئینجیلەکەو -پەیامی- پێغەمبەران دەڵێنەوە؟!

داخەکەم! هەموو گەنجانی مەسیحیی ئەمڕۆ کە بە بەهرەکانیان سەرنجی چواردەوریان ڕادەکێشن، تەنها شارەزای زمانی عەرەبی و ئەدەبی عەرەبین، ئەوان لە لێکۆڵینەوەی سەرچاوە عەرەبیەکاندا قاڵ بوونەتەوەو چی وزەو توانایان هەیە بەخەرجی دەدەن لە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی ئەو بوارەدا، سەرمایەیەکی زۆر بە

(١) - الله لیس کذلك، دار الشروق، ص ٤٢.

خەرج دەدەن لە بەدەستخستنی کتێبە عەرەبییەکاندا، لە هەموو شوێنێکدا بە ئاشکرا ئەوە بڵاو دەکەنەوە کە ئەم ئەدەبە عەرەبییە جێی سەرسوڕمان و شایەنی بە گەورەدانانیەتی، ئەگەریش کەسێك بیەوێت لە کتێبەکانی مەسیحیەتەوە بە بەڵگەیەك قەناعەتیان پێ بکات، زۆر بە سووك تەماشای دەکەن و باس لەوە دەکەن کە ئەو کتێبانە جێی بایەخ و گرنگی پێدان نین!

ئەی هاوار! مەسیحییەکان تەنانەت زمانی دایکی خۆیان بیرچۆتەوە، ئەمرۆ لەنێو هەزار کەسدا یەك کەس بەدیناکەیت بتوانێت بە لاتینیەکی دروست نامەیەك پێکەوەبنێت، لەکاتێکدا بە پێچەوانەوە، ناتوانیت ئەو کەسانە بژمێریت کە لە دەربڕین و نووسینی عەرەبیدا بەهێزن، تەنانەت هەیانە بە عەرەبی شیعر دەچڕێت، تەنانەت لەو بوارەدا پێش خودی عەرەبەکان کەوتون).

پێشتر لە کاریگەریی دووەمدا باسم لەوە کرد کە فیلم و ڕۆمانەکان هۆکاری وەرگرتنی بەها ڕۆژئاواییەکانن لە کۆمەڵگەی خۆماندا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئەمە بە تەنها کارتێکەرێکی بەهێز نیە ئەگەر هاتو هاودەم نەبێت بە داڕمانێکی شارستانیی لەنێو ناخی خودی موسڵماندا.

ئیبن خەلدوون لە پێشەکیەکەیدا بنەمایەکی داناوە کە ناوبانگەکەی گەیشتۆتە ئەمسەر و ئەوسەری دنیا، ئەویش بریتیە لە کاریگەریی زاڵبوو بەسەر شکستخواردوودا، ئینجا دەڵێت (بۆیە دەبینیت هەمیشە شکستخواردوو لە جلوبەرگ و سواری و چەك و شێوەو هەڵگرتنیدا، تەنانەت لە هەموو حاڵ و بابەتێکیدا، خۆی دەچوێنێت بەسەر زاڵبوودا، تەنانەت ئەگەر دوو ئوممەت -نەتەوە یان تاقم و کۆمەڵێك- دراوسێی یەکدیش بن، یەکێکیان سەربکەوێت بەسەر ئەوی تردا، ئەوە لەو خۆچواندن و پێشەنگی پێوەکردنەدا پشکێکی گەورە بەر لایەنی زاڵبوو دەکەوێت -واتە شکستخواردووەکە خۆی دەچوێنێت بە زاڵبووەکە).

لەو نووسینە جوانانەی لەو بوارەدا نوسراون، کتێبی (ینبوع الغواية الفكرية) ی عەبدوڵا عوجەیریە، لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەدات کە زۆربەی لادانە هزرییەکانی ئەم سەردەمە، دەگەڕێنەوە بۆ یەکێك لەم دوو بوارە:

١- هەژموونی نموونەی ڕۆشنبیریی بیانی.

٢- لاوازیی لە خۆبەدەستەوەدانی موسڵمان بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی.[١]

پاشان دەڵێت: (ئەگەر لە زۆربەی ئەو بابەتە هزرییانە رابمێنیت کە لە مێژووی هاوچەرخدا وەك رەشەبایەك هەڵیانکردۆتە سەر ئوممەتی ئیسلام، تێدەگەیت لە کاریگەریی هەژموونی نموونەی رۆشنبیریی لە وێناکردنی هزر و تێڕوانینەکاندا، ئەوکات دەتوانیت زۆر هەوڵی بە ئیسلامیکردنی بیرە رۆژهەڵاتی یان رۆژئاواییەکان راڤە بکەیت، لە سەردەمی هەژموونی بەها سەربازییەکاندا، خوێندنەوەیەکی سەربازییانە کراوە بۆ ئیسلام، لە سەردەمی هەژموونی نموونەی سیاسیی دیموکراتیشدا خوێندنەوەیەکی دیموکراتیانە دەکرێت بۆ ئیسلام، بۆیە ئاساییە لە سەردەمی هەژموونی لیبرالیەتیشدا خوێندنەوەیەکی لیبرالیانە بکرێت بۆ ئیسلام، هاودەم بەو ئامادەییە خۆسەپێنییەی بەها لیبرالیەکان لە دیمەنی جیهانیدا، کەشێکی گشتیی لیبرالی لێ بەرهەم دێت، ئەمەش وەك فشارێکە کە لەو روانگەوە -بە هۆشیارییەوە بێت یاخود بێئاگایانە- زۆربەی قەناعەت و تێڕوانینەکانی والێکردووە هەموو، یان بەشێك لەو بەهایانە لەخۆبگرن و پەیرەویان بکەن، دواتر، لە سایەی ئەو بەها و تێڕوانینانەدا خوێندنەوە بۆ دەقە شەرعیەکانیش بکەن، ئەمەش وەك هەوڵێکە بۆ رێکخستنەوەی دیمەنی ئیسلامیی بەپێی بەها لیبرالیەکان.

لەگەڵ لێکهەڵوەشانی چەمك و واتا لیبرالیەکان و خستنەڕووی تەگەرە و ناتەواوی و لادانەکانی و نەگونجانی لەگەڵ زۆربەی بەها شەرعیەکان، ئەو هەوڵانە کاریگەرییان سنووردار دەمێنێتەوە، چونکە ئەو چەمك و واتا لیبرالیانە خۆیان بە ژیاریی خۆسەپێنی رۆژئاوایی بەهێزکردووە).[٢]

پشتیوان بە خوا لە باسی بنەما خۆپارێزییەکاندا لەسەر ئەوە قسە دەکەین کە رێکخستنەوەی لەپێشینە گەورەکان لە دیدی مرۆییەوە، بابەتێکی زۆر گرنگە بۆ پووچەڵکردنەوەی کاریگەری ئەو هۆکارە، لەو نووسینە بەهێزانەی لەسەر ئەم بابەتە نووسراون، کتێبەکەی ئیبراهیم سەکرانە بە ناونیشانی (سلطة الثقافة الغالبة).

---

(١) - ینبوع الغوایە، ص ١٩.

(٢) - ینبوع الغوایە، ص ٢٣.

## جۆری دووەم لە كاریگەرییەكان: هۆكارە ناوخۆییەكان:

ئەو هۆكارە دەرەكییانەی كە پشكیان هەیە لە كاریگەر بوون بەو گومانە سەردەمییانەی بەرامبەر بە ئیسلام و بنەڕەتەكانی دەخرێنەڕوو، تەنها كاتێك كاری راستەقینەی خۆیان دەكەن كە شوێنێكی گونجاو هەبێت توێژی بەئامانجگیراوی لەخۆ گرتبێت، واتە بوونی كەلێن و كەلەبەر لەنێو ئەو توێژە ئیسلامیەی كە لە ئەگەری كاریگەربووندان بەو كارتێكەرە دەرەكیانەی پێشوو، لێرەدا تەنها شەش كارتێكەریان باس دەكەم:

## كارتێكەری یەكەم: لاوازیی دڵنیایی:

زۆر لەسەر ئەم كارتێكەرە نادوێم، هەرچەندە گرنگترینی كارتێكەرەكانە، چونكە دواتر لە بنەما خۆپارێزییەكاندا قسەی لەسەر دەكەم، بەڵام ئەوەی دەمەوێت لێرەدا بیڵێم، یان ئەو پرسیارەی دەمەوێت لە عەقڵی خوێنەری ئازیزدا بیوروژێنم، ئەم خاڵەیە:

پرسێكی وەك واجببوونی نوێژ لە كاتی خۆیدا كە یەكێكە لەو پرسانەی هەموان كۆكن لەسەر ئەوەی نوێژ یەكێكە لە گرنگترین فەرزە كردارییەكانی نێو موسڵمانان، هەروەها كۆدەنگن لەسەر ئەوەی دواخستنی ئەو نوێژە بۆ دوای كاتی خۆی، یەكێكە لە تاوانە گەورەكان.

پرسیارەكە لێرەدا ئەوەیە: چۆن شرۆڤەی ئەو دەستشلكردنە بەرچاوەی ژمارەیەكی زۆری موسڵمانان دەكەیت لە بەجێگەیاندنی نوێژ لە كاتی خۆیدا؟

من پێم وایە، هاودەم بە چەند هۆكارێكی دی، لاوازی دڵنیایی، هۆكاری گەورەی ئەو دەستشلكردنەیە.

زۆربەی موسڵمانان وێڕای لاوازی دڵنیاییان، پارێزراون لە كوفر و ئیلحاد، چونكە بەوە تاقی نەكراونەتەوە تووشیان ببێت بە تووشی كەسانێكەوە كە گومانیان بۆ دروست بكەن لەسەر ئایینەكەیان، بەڵام ئەگەر سەبارەت بە بنەڕەتی ئیسلام، یان بنچینە چەسپاوەكانی ئایینەكەیان گومانێكی بەهێزیان بێتەڕێ، لەوانەیە

ASTANA

ئیمانەکەیان لەبەردەم ئەو گومانەدا بەرگە نەگرێت، وەك چۆن ئیبن تەیمیە لەم دەقە جوانەدا ئاماژەی پێ دەدات:

(زۆربەی خەڵك ئەگەر دوای بێباوەڕی موسڵمان بن، یان بە موسڵمانێتی لەدایك بن و پابەندی شەریعەتەکانی ئیسلام بن و ملکەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بن، ئەمانە موسڵمانن و ئیمانێکی گشتی پێیە، بەڵام ئەوەی کە حەقیقەتی ئیمان بچێتە ناو دڵیانەوە، ئەگەر بێتو خوای گەورە ئەوەیان پێ ببەخشێت، ئەمە شتێکە کە هەنگاو بەهەنگاو دێتەدی، ئەگەرنا زۆربەی خەڵك ناگەنە قۆناغی دڵنیایی و جیهاد، ئەگەر گومانیان لا بوروژێنرێت، گومان دەکەن، ئەگەر فەرمانیان پێ بکرێت بە جیهاد، بەجێی ناگەیەنن، خۆ ئەوانە نە بێباوەڕن و نە دووڕوو، بەڵام هێندە زانستی دڵ و مەعریفە و دڵنیایی ئەو زانستەیان پێ نیە کە دووریان بگرێت لە گومان، هێزێکی وای بەهێزی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەشیان نیە کە بتوانن ئەو خۆشەویستیە پێش سامان و کەسوکار و ماڵ و منداڵ بخەن، ئەوانە ئەگەر لە دەست میحنەت و تاقیکردنەوە پارێزراو بوون و مردن، دەچنە بەهەشتەوە، ئەگەریش تاقیبکرێنەوە بە کەسانێك کە گومانیان لا بوروژێنن، گومان و دوودڵییان لا دروست دەبێت، ئەگەر خوای گەورە رەحمیان پێ نەکات و ئەو گومان و دوودڵیەیان لێ دانەماڵێت، دەبنە کەسانی دوودڵ و دەچنە قۆناغی جۆرێك لە دووڕوویی).[١]

## کارتێکەری دووەم: کێشە دەروونی و فشارە کۆمەڵایەتیەکان:

باسی چەندین حاڵەت دەکەم کە لەنێوان خۆم و بەرامبەردا هەبووە و مشتومڕ روویداوە لەسەر ئیمان بە خوای گەورە، هۆکاری بوونی کێشە لای لایەنی بەرامبەر، هەندێ فشار و تاقیکردنەوە بون کە نەیتوانیوە لە دەستیان دەرباز بێت، زۆرجار ئەو فشارە دەروونیەی کە مرۆڤ بەدەستیەوە دەناڵێنێت، هۆکارێکە بۆ تووڕەیی و نارازیبوونی لە ئاست قەزا و قەدەری خوای گەورەدا، دواتر دەگاتە ئەوەی نکوولّی لە بوونی خوای بەدیهێنەر بکات، یان تۆمەت بخاتە پاڵ حیکمەت و دادپەروەری پەروەردگار.

(١) - مجموع الفتاوی (٧/٢٧٠).

ئەم کارتێکەرەیان تایبەت نیە بە سەردەمی نوێوە، بەڵکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی کەسانێکی کردووە کە پاش ئەوەی پێشتر پەرستشی خوایان هەبووە، روو وەردەچەرخێنن و هەڵدەگەڕێنەوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە تووشی نارەحەتییەك بون، خوای گەورە دەفەرمویێت (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ)،[1] (لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە لەسەر گومان پەرستشی خوا دەکەن و دامەزراو نین، کەسی وا ئەگەر خێرێکی دنیایی بێتەڕێ، ئەو لەسەر ئایینەکەی ئەمێنێتەوەو بەردەوام ئەبێت، بەڵام ئەگەر تووشی نەخۆشیی، یان نەبوونی بێت، دەستبەرداری دینەکەی ئەبێت و پاشگەز ئەبێتەوە لە باوەڕەکەی، بەهۆی ئەمەوە دونیا و قیامەت لەدەست ئەدات، بەدڵنیاییەوە ئەمەش زەرەرمەندێتیەکی روون و ئاشکرایە).

وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، ئیبن عەبباس بەم چەشنە تەفسیری ئەم ئایەتە دەکات (کەسێك دەهاتە مەدینە، ئەگەر ژنەکەی کوڕی بوایە و ئەسپەکەی بزایە دەیوت ئەم ئاییینە باشە، بەڵام ئەگەر ژنەکەی کوڕی نەبوایە و ئەسپەکەی نەزایە، دەیوت: ئەمە دینێکی خراپە).[2]

موفەسیری بەتوانا شێخ ئیبن سەعدی رەحمەتی خوای لێ بێت، زۆر جوان لەسەر ئەم ئایەتە دواوەو دەڵێت: (واتە، لەنێو خەڵکدا کەسی وا هەیە ئیمانی لاوازەو هێشتا ئیمان نەچوەتە ناو دڵیەوە و تام و چێژی ئیمان تێکەڵ بە دڵ و دەروونی نەبووە، بەڵکو یان بەهۆی ترسەوە، یان بەهۆی عادەت و باوی ناو خەڵکەوە هاتۆتە ناو ئیسلامەوە، بە چەشنێك کە لەکاتی نارەحەتیەکاندا نەتوانێت پێچەسپاو رابوەستێت، ئەگەر چاکەیەکی هاتەڕێ و رۆزیەکەی بەردەوام بوو و هیچ جۆرە ناخۆشیەکی نەهاتەڕێ، بەو خێرە رازی و دڵنیا دەبێت نەوەك بە ئیمانەکەی، ئەم جۆرە کەسانە لەوانەیە خوا رەحمیان پێ بکات و پارێزراو بن و فیتنەی وایان

---

(١) - الحج: ١١.

(٢) - صحيح البخاري، الرقم ٤٧٤٢.

نەهێنێتە ڕێ کە لە دینەکەیان لایان بدات، بەڵام ئەگەر ناخۆشیەکیان تووش بوو، یان خۆشەویستێکیان لەدەستدا، لە دینەکەیان هەڵدەگەڕێنەوە، بەمەش دۆڕاوی دنیا و ئاخیرەتیش دەبن، لە دنیادا ئەو کەسە بەهۆی لەدین هەڵگەڕانەوەکەی ئەو شتەی دەست ناکەوێت هیوای پێ دەخواست و هەڵگەڕانەوەکەی بە سەرمایە دەزانی و وایدەزانی بەوە قەرەبووی دەست دەکەوێتەوە، بەمەش ڕەنجەڕۆ دەبێت و تەنها ئەوەشی دەست دەکەوێت کە بۆی براوەتەوە، لە ڕۆژی دواییشدا ڕوونە کە بێبەش دەبێت لەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی هێندەی زەوی و ئاسمانەکانە و سزای دۆزەخیشی تووش دەبێت، ئەمەش خەسارۆمەندییەکی زۆر ڕوون و دیارە).[(١)]

## کارتێکەری سێیەم: لاوازی لایەنی پەرستشیی، بە تایبەت کارەکانی دڵ:

زۆر بە کەمی موسڵمانێك بەدیدەکەیت لە ڕووی ئیمانیەوە گرنگی بدات بە دڵی و ئاستی پەیوەستبوونی دڵی بە خوای گەورە و پشتبەستنی بەخوا و خۆشەویستی بۆ پەروەردگاری چاودێریی بکات و هەوڵ بدات خاوێن ڕایبگرێت لە ناپاکی و ئێرەیی و خۆبەزلزانی، هەرکەس ئەمە بکات، لەنێو چێژێکی ئیمانی وادا دەژی کە هیچی تری پێ ناگاتەوەو تەنانەت تەنها جارێکیش بیر لەوە ناکاتەوە بیگۆڕێتەوە بە شتێکی تر، بەڵام هەرکەس ئەمانە لەدەست بدات، حەزی بۆ هەر سەرنجڕاکێشیەکی تر لا پەیدا دەبێت.

## کارتێکەری چوارەم: لاوازی ئامرازەکانی توێژینەوەو پشتڕاستکردنەوەو مەعریفە:

بڵاوبوونەوەی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە لای هەر کۆمەڵگەیەك و بەرزبوونەوەی ئاستی پێناوەکانی توێژینەوەو بواری زانستی لەو کۆمەڵگەدا، وادەکات زۆر بە سەختی بکەوێتە ژێر کاریگەری بیر و هزری دەرەکیەوە، پێچەوانەکەشی ڕاستە.

تێبینی ئەم حاڵەتە دەکەین لە مەسەلەی بڵاوبوونەوەی زۆربەی ئەو گومانانەدا کە بۆ خۆپاراستن لێیان تەنها پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی ڕەخنەگرانە و وردبینیەکی زانستی هەیە بۆ ئەوەی کاریگەریی ئەو گومانانە پووچەڵ بکاتەوە،

---

(١) - تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، ص ٥٣٤ ، ٥٣٥.

لەم كتێبەدا باس لەوەش دەكەین كە یەكێك لە بنەما خۆپارێزییەكان بریتیە لە پێكهێنانی عەقڵی رەخنەگرانە و بەهێزكردنی پێناوەكانی توێژینەوەی زانستی.

## كارتێكەری پێنجەم: لاوازیی زانستی شەرعی:

لە دوو خولی (چۆن مامەڵە بكەین لەگەڵ گومانە هزریە هاوچەرخەكاندا) راپرسیەكم ئەنجام دا سەبارەت بە هۆكارەكانی بڵاوبوونەوەی گومانەكان، لەو وەڵامانەی كە زۆرترین دەنگیان هێنا، بریتی بوو لە لاوازی زانستی شەرعیی لای گەنجان.

ئەوەی كە لاوازی زانستی شەرعی هۆكارێكە بۆ كاریگەربوون بە گومانەكان، لەبەرئەوەیە كە رەگداكوتانی شەرعیی وا لە هەڵگری ئەو زانستە شەرعیە دەكات بنەمایەكی مەعریفی و مەنهەجیی وای هەبێت، كە بەهۆیەوە بتوانێ هەرچی زانیاری و شرۆڤەیەكی نوێ دێتە نێو هۆشیەوە، دادگایی بكات و بیخاتە بەردەم دادگایی، بەڵام هەركەس ئەم بنەما مەعریفیەی نەبێت، دەكرێت ئاسان بكەوێتە نێو بارگرژیی مەنهەجیی و كەوتنی گەورەی مەعریفیەوە.

## كارتێكەری شەشەم: دەستبەتاڵیی كاتیی و هۆشیی و رۆحیی:

باسی حاڵەتی ئافرەتێك دەكەم كە تووشی وەسوەیەكی بیروباوەڕیی سەختی وابووبوو كە لە تەمەنمدا شتی وام نەدیبوو و نەبیستبوو، زۆر هەوڵمدا بە شێوازی دەربازبوون لە وەسوەسە رازیی بكەم و قەناعەتی پێ بهێنم، بەڵام نەهات بەدەممەوە، وابزانم چووبوو بۆ لای پزیشكێكی دەروونیش، بەڵام بێسوود و دەستبەتاڵ لێی دەرچوو، ئینجا رێنموونیم كرد بۆ چەند كارێكی زانستی و مەعریفی هەتا كات و هۆشی خۆی بەوە پڕ بكاتەوە -چونكە تەواو دەستبەتاڵ بوو-، ئەنجامەكە زۆر لەوە باشتر بوو كە چاوەڕوانم دەكرد، ئیتر لەماوەیەكی پێوانەیی كەمدا لێشاوی پرسیارەكانی وەستا، زێدەڕۆیی لەم بابەتەدا ناكەم و پێویستیشم بە شتی وا نیە، بەڵكو مەبەستەكە ئەوەیە كە دەستبەتاڵیی هۆشیی و رۆحیی، وا لە دڵ و هۆش دەكات دوچاری هەر سەرقاڵیەكی تر ببێت با سەرقاڵیەكە خراپیش بێت،

بەڵام ئەگەر كاتەكانی پڕ كردبوونەوە و هۆش و ڕۆحی تیژ زانست و پڕكردار و مەعریفە و ئیمان بوو، ئەمە دەبێتە بەربەست و ڕێگرێك لەبەردەم زۆربەی ئەو بیرو هزرە لادەر و بیركردنەوە ڕاڕابەخشانەدا.

## جۆری سێیەمی كارتێكەرەكان لە بڵاوبوونەوەی گومانەكان:

بوونی كەموكورتی لە شێوازی بانگەواز و ئاراستەكردن و چارەسەرە شەرعیەكاندا، لایەنەكانی كەموكورتیش لە چەند وێنە و شێوەیەكدا دەردەكەون، لەوانە:

**یەكەم:** بۆشایی نێوان زۆربەی تایبەتمەندانی بواری شەرعیی و گەنجان بە گشتی، ئەم بۆشاییە وادەكات لە وێناكردن و تێگەیشتنی واقیعدا كەموكورتیەك دروست ببێت و كەنارگیرییەكی هەستیی نێوان هەردوو لای لێ بكەوێتەوە، لەوەش خراپتر، دەبێتە هۆی لەكارخستنی ڕۆڵی ئەو پێشەنگانەی كە لە بواری چاكسازیدا پێگەیەكی دیار و بەرچاویان هەیە.

دەتوانیت بچیتە خزمەت ژیاننامەی پێغەمبەری خوا و نزیكی ئەو پێشەوایە لە چینە جیاجیاكانی كۆمەڵگە ببینیت، بزانیت ئەو نزیكیە چ كاریگەریەكی هەبووە لەسەر ئەو خەڵكەی ڕەوشتی بەرز و نەرمونیانیی و خۆڕاگرییان لە كەسێكدا بەدیدەكرد كە -وەك خۆیان- بەسەر زەویدا ڕێ دەكات، ئەمە چ واتایەكی جوان و بەهایەكی ئەرێنی هەیە لەنێو دڵ و دەروونی خەڵكدا!

**دووەم:** كەمیی هەمەچەشنەكردنی شێوازە بانگەوازیەكان بە چەشنێك كە گونجاو بێت بۆ نوێگەریی و كارتێكەرەكانی واقیع، پێغەمبەری خوا ﷺ لە گوتاریدا زۆر سوور بوو لەسەر هەمەچەشنەكردنی شێوازەكانی گەیاندنی زانیاریی شەرعی، هەندێ جار بە پرسیار، جارجارە بە وێنەكێشان، هەندێ كات بە وتاری بەهێز، لەكاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووناكی وەحی پێ بوو و خوای گەورەش پشتیوانی دەكرد بە چەشنێك بێمنەت بێت لە زۆرێك لەو شێوازانە.

جا پێشەنگی کردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بوارەدا، بابەتێکی گرنگ و پێویستە، بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە تیایدا بازاڕی ڕاگەیاندن گەرمە و جادووی وێنە کاریگەرە.

**سێیەم:** بەرتەسکیی مەیدانی گفتگۆی کراوە کە تیایدا گەنج هەست بەوە دەکات پێناوێکی پارێزراو ئاسۆی فراوان هەیە کە بتوانێت گوێ لە پرسیار و گرێ و گرفتەکانیان بگرێت.

چەند بیر و هۆشم لای ئەوەیە بارودۆخێکی گفتگۆی وا بێتەدی کە بتوانم لە مەیدانی بانگەوازیدا ببینم، شوێنێك پڕ لە گەنج و سەکۆیەك بۆ وانەبێژێك کە توانای شەرعیی و پێگەیشتنی هزریی و مەعریفەیەکی فراوانی هەبێت، توانای قەناعەتپێهێنان و هونەری گفتگۆی باڵای هەبێت، دەرفەت کراوە بێت بۆ بەشداریی و پرسیار و گرێ و کێشەی گەنجان و لەوپەڕی ئازادی و ئارامیدا قسەی خۆیان بکەن، بە جوانی پێشوازییان لێ بکرێت و وەڵامی پڕاوپڕ وەربگرنەوە، وەك چۆن ئەحمەد دیدات ئەمەی دەکرد و ئێستایش زاکیر نایك سەرقاڵە پێوەی، ئەمە چ پەیامێکی ئەرێنی لە دەروونی ئامادەبواندا دەچێنێت! چەند بیرو بڕوا ڕاست دەکرێنەوە، چەند گرێ و گۆڵ دەکرێنەوەو چەند دڵ و دەروون پاك دەبنەوە! چەند دڵ ئارامی و دڵنیایی وەردەگرن!

نازانم ئایا ئەم خەونە دێتەدی؟ نزیکە یان دوور؟ چەند بانگخواز هەن توانای ئەوەیان هەیە لە شوێنێکی ئاوەهادا بوەستن؟ خوایە حاڵمان چاك بکەیت.

**چوارەم:** لاوازی گوتاری شەرعیی عەقڵی بەڵگەدار، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین هۆکارەکان کە لە بەندی دواتردا درێژەی پێ دەدەم، ئەویش بریتیە لە:

# شێوەو تایبەتمەندییەکانی گوتاری ئایینی کاریگەر لە مەیدانی هزریی هاوچەرخدا

لێرەدا باس لە پێنج شێوەو تایبەتمەندیی دەکەم کە ئەگەر لە گوتاری بانگەوازیدا هەبن، ئەوە پشتیوان بە خوا لە مەیدانی هزریی هاوچەرخدا کاریگەریەکی گەورەی دەبێت، بە جۆرێك لە جۆرەکان درێژەم داوە بە یەکەمیان -لەبەر گرنگیەکەی-، هیوادارم ئەو درێژەپێدانە ریزبەندیی شێوەو تایبەتمەندییەکان لە هۆشی خوێنەردا نەپچڕێنێت، بۆیە با پێشوەختە ئامادەکاریی بۆ بکات.

## شێوەو تایبەتمەندیی یەکەم: گرنگیدان بە گوتاری عەقڵیی:

کەسی وا هەیە پێی وایە بەڵگە شەرعیە نەقڵیەکان هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیی لەخۆناگرن، بۆیە بەڵگەی نەقڵی لە ئاست بەڵگەی عەقڵیدا بە کەم دەگرێت و وا قسە دەکات کە دڵنیایی تەنها بە بەڵگەی عەقڵیی بەدەست دێت نەوەك بە بەڵگەی نەقڵی، ئەمەش راست نیە، چونکە بەڵگە شەرعییەکان پڕن لە بەڵگەی عەقڵیی لەسەر بنەمای بیروباوەڕیی و یەکخواپەرستی.

ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (بەڵکو ئەوەی پێشین و پێشەوایانی ئوممەت کە هەڵگری ئیمان و زانست بوون، لەسەری بون، ئەوەیە کە خوای گەورە هێندە بەڵگەی عەقڵیی باسکردووە کە لە بواری زانستدا پێویست بێت، بەچەشنێك ئەو خەڵکە نەتوانن پێی بگەنەوە، بەڵکو هەموو ئەوەی ئەوان باسی دەکەن، لە قورئاندا بە پوختی و بە جوانترین شێوە هاتووە).[1]

ئیبن ئەبیلعیززی حەنەفی دەڵێت: (ئەگەر کەسی ژیر لەو رێکارە عەقڵیانە رابمێنێت کە ئەهلی کەلام و فەیلەسووفان باسیان دەکەن، دەبینن ئەو رێکارانەی کە

---

(١) - مجموع الفتاوى (١٨٤/٣).

راستن، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێگە عەقڵیانەی کە قورئان بە روونترین و پوختترین دەربڕین باسی کردون، لە ڕێکارەکانی ناو قورئاندا ئەوپەڕی روونی و بەدیهاتن بەدیدەکەین، لەکاتێکدا ئەمە لای ئەهلی کەلام و فەیلەسووفان نابینین).[١]

هەرکەس قورئان بخوێنێتەوەو لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ رابمێنێت، دەبینێت گوتاری عەقڵیی لەو دوانەدا ئامادەییەکی بەرچاو و دیاری هەیە.

بۆ نموونە: ئەو ئایەتانەی لە قورئانی پیرۆزدا باسی زیندووبوونەوە دەکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

(أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ)،[٢] (ئایا نابینن ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، توانای هەبێت هاوشێوەی ئەوانیش بەدیبهێنێت).

(أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)،[٣] (ئایا نابینن ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوەو ماندوو و لاواز نەبووە لە بەدیهێنانیاندا، توانای ئەوە هەیە لەسەرئەوەی مردوویش زیندوو بکاتەوە، بەڕاستی خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

ئەمە ئەوپەڕی قەناعەتپێهێنانی عەقڵییە، چونکە بێباوەڕانی قوڕەیش دانیان بەوەدا دەنا کە خوای گەورە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، بەڵگەکەش ئەوەیان بۆ دەخاتەڕوو کە ئەو خوایەی بتوانێت ئاسمانەکان و زەوی لە نەبوونەوە بەدیبهێنێت، دەشتوانێت شتی تری وەك ئەوەش بەدی بەدیبهێنێت، دەی زۆر ئاسانترە شتی لەوانە بچووکتر یان کەمتر بەدیبهێنێت (لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ)،[٤] (بەدڵنیاییەوە بەدیهێنانی زەوی و ئاسمانەکان زۆر گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی).

---

(١) - شرح العقيدة الطحاوية (٧٦/١).
(٢) - الإسراء: ٩٩.
(٣) - الأحقاف: ٣٣.
(٤) - غافر: ٥٧.

گوتارێكی دیكەی عەقڵیی لە قورئاندا فەرمایشتی خوایە كە دەفەرموێت (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ)،[۱] (ئایا بەبێ هیچ شتێك و لە هیچەوە بەدیهێنراون؟ یان خوایەك هەیە بەدیهێناون).

ئەم دابەشكردنە وا لە عەقڵ دەكات ئەگەرەكان لەنێوان دوو بەشی باسكراودا دابنێت، كاتێك بەڵگەی بەهێزی دەستناكەوێت بۆ پشتیوانی یەكێكیان، ئەوە ئەوكات بۆ بژاردەی سێیەم دەگەڕێت كە ئایەتەكانی دواتر یان ئەوانەی پێشتری باسیان كردووە، ئەویش زاتی خوایە.

لەو كتێبانەی لەم بوارەدا نووسراون، بریتین لە:

الأدلة العقلية النقلية على أصول الإعتقاد لە نووسینی: دكتور سعود العريفي.

بلاغة الإحتجاج العقلي في القرآن الكريم لە نووسینی: زەینەب كوردی.

مناهج الجدل في القرآن لە نووسینی: زاهر بن عواض الألمعي.

كاتێكیش دەچینە سەر فەرموودە، دەبینین چەندین هەڵوێست هەن كە قەناعەتپێهێنانی عەقڵیی تیایاندا لەوپەڕی بەرزی و جوانی و بەڵگە و قەناعەتپێكردندایە، لەوانە:

ئەو فەرموودەی ئەبووهورەیرە كە هەریەك لە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە دەڵێت: كابرایەك لە بەنی فەزارە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ژنەكەم كوڕێكی ڕەشپێستی بووە، ئەویش فەرمووی (ئایا وشترت هەیە؟) كابرا وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (ڕەنگیان چۆنە؟) وتی: سوور، فەرمووی (ئەی ئایا ڕەنگی (ئەورەق)[۲] یان تێدایە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی ئەی چۆن شتی وا دەبێت؟ كابرا وتی: لەوانەیە لە پشتێكیەوە بۆی هاتبێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (وَهَذَا عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ)،[۳] (دەی لەوانەیە ئەمیش لە پشتێكیەوە بۆی هاتبێت).

---

(۱) - الطور: ۳۵.

(۲) - ئەورەق: ڕەشییەك كە بەلای خۆڵەمێشیدا بدات، وەرگێڕ.

(۳) - صحيح البخاري، الرقم ۵۳۰۵، صحيح مسلم، الرقم ۱۵۰۰.

## ڕێگاکانی دواندنی عەقڵەکان

پێناوەکانی دواندنی عەقڵەکان چەند جۆرێکن:

هەیانە دەگەڕێتەوە بۆ شێواز و ڕێکاری گوتارەکە.

هەیانە دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی بەتاڵکردنەوەی قسەی نەیاران.

هەیانە دەگەڕێتەوە بۆ هەنگاوێکی پێشووتری دەستنیشانکردنی سنووری عەقڵ و پەیوەندیی لەنێوان عەقڵ و خۆبەدەستەوەدانی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی.

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ شێوازی گوتارەکە، جا ئەو شێوازانەی کە عەقڵی پێ دەجووڵێنرێت، جۆراوجۆرن، لەوانە:

شێوازی پرسیارکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گەیاندنی هەندێ زانیاریی ئەمەی بەکارهێناوە، وەك:

لە فەرموودەکەی ئیبن عومەردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ تُشْبِهُ، أَوْ: كَالرَّجُلِ الْمُسْلِمِ ، لَا يَتَحَاتُّ وَرَقُهَا)،[1] (پێم بڵێن چ درەختێك هەیە لە پیاوی موسڵمان دەچێت و گەڵاکانی ناوەرێن).

یان لە فەرموودەکەی ئەبووهورەیرە کە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (ئایا دەزانن مایەپووچ کێیە؟) وتیان: مایەپووچ لەناو ئێمەدا ئەو کەسەیە کە هیچ درهەم و شمەکێکی نەبێت، ئەویش فەرمووی (إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا ، وَقَذَفَ هَذَا ، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا ، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا ، وَضَرَبَ هَذَا فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ)،[2] (مایەپووچ ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی دواییدا بە -کۆڵێك- نوێژ و

---

(١) - صحيح البخاري، الرقم ٤٦٩٨.

(٢) - صحيح مسلم، الرقم ٢٥٨١.

ڕۆژوو و زەکاتەوە دێت، کە دێت، دەبینێت قسەی وتووە بە فڵانەکەس و تۆمەتی داوەتە پاڵ فڵان و ماڵ و سامانی فیسارە کەسی خوادرووەو خوێنی فڵانەکەسی ڕشتووەو داویەتی لە فڵان کەس، ئینجا لە چاکەکانی هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەمیان و بەویان، ئەگەر پێش ئەوەی قەرزەکانی تەواو بدرێنەوە چاکەکانی تەواو بن، ئەوکات لە تاوان و هەڵەی ئەوان هەڵدەگیرێت و دەدرێت بەسەر ئەمدا، ئینجا فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە).

شێوازی قیاس (پێوانە) و نموونە هێنانەوە، نهێنی نموونە هێنانەوە لەڕووی عەقڵیەوە بریتیە لە قیاس، لەو نموونانەی سەردەم کە دەکرێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بهێنرێتەوە: چۆن بڕوا بە خوای گەورە بهێنین لە کاتێکدا نایبینین؟ نموونەکە بریتیە لە ئەلیکترۆن، لە کاتێکدا یەکێکە لە بوارە زانستیانەی کە زانایان وەك ڕاستیەکی هەبوو مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن لەکاتێکدا ناتوانن ببینن، بەڵکو تەنها شوێنەوارەکانی دەبینن، بەهەمان شێوە، ئێمەش بڕوامان هەیە بە خوای گەورە ئەگەرچی نایبینین، بەڵام شوێنەوارەکانی دەبینین.

شێوازێکی دیکە بریتیە لە گرتنەبەری توانای پێشکەشکردن و قەناعەت پێهێنان، ئەمەش لەو لێهاتووییانەیە کە پێویستە توێژی بانگخوازان و وتاربێژان زۆر چاك بن تیایدا، تەنانەت ئەوەیان کە لەو بوارەدا بەهرەی پێ دراوە، دەتوانێت سوود وەربگرێت لە هەندێ لێهاتوویی لە بەرنامەی پێشکەشکردن و خولی قەناعەتپێکردندا.

شێوازێکی تری گەیاندنی زانیاری بە عەقڵەکان بریتیە لە گرنگیدان بە دانان و داڕشتنەوەی پێشەکییە بەڵگە نەویستەکان، ئینجا لەوێوە هەنگاو هەڵنرێت بۆ ئەو ئەنجامەی کە پێویستە بچەسپێنرێت، ئەمەش لە گرنگترینی کارەکانە.

نموونە:

هەنگاونان لە پێشەکی (قورئان بۆ هەموو مرۆڤێك دابەزیوە نەوەك تەنها بۆ هاوەڵان) بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەی کە ئێمە بە چەند ئایەتێك دوێنراوین هەتا گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوا بکەین و ناتوانین ئەو ئایەتانەیش جێبەجێ بکەین

ئەگەر شوێن ئەو فەرموودە صەحیحانە نەکەوین کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراونەتەوە.

هەموو ئەمانە لە جۆری یەکەمی ڕێگاکانی دواندنی عەقڵەکاندا خۆیان دەبیننەوە.

**جۆری دووەم:** کە بریتیە لە شێوازی بەتاڵکردنەوەی قسەی نەیاران، ئەمەش بە چەند ڕێگەیەك دەبێت:

نیشاندان و زەقکردنەوەی نەگونجانە عەقڵیی یان مەنهەجییەکان لە گوتاری نەیاراندا.

نموونە: نیشاندان و زەقکردنەوەی دووقسەیی ئەو کەسەی نکووڵیی فەرموودە دەکات، کاتێك بۆ قسەیەکی خۆی فەرموودەیەك بە بەڵگە دەهێنێتەوە.

نیشاندان و زەقکردنەوەی دەرنجامە خراپەکانی وتەی نەیاران.

نموونە: نیشاندانی خراپەی قسەی مولحیدان و نائاییینیەکان کە نکووڵی زیندووبوونەوەو لێپێچینەوەی ڕۆژی دوایی دەکەن، ئەویش بە پرسیارکردن سەبارەت بە سەرەنجامی ئەو ستەمکارانەی کە هەزاران یان ملیۆنەها مرۆڤیان کوشتووە، ئایا ئەوانە دوای مردنیان سزا دەدرێن؟ ئایا ستەملێکراوان ما فیان بۆ وەردە گیرێتەوە لە ستەمکاران؟ مولحیدان دان نانێن بە زیندووبوونەوەدا، ئەوکات خراپی وتەکەیان ئەوەیە کە هیچ جیاوازییەك نیە لەنێوان ستەمکار و ستەملێکراودا، بەڵکو بارودۆخی ستەمکار باشترە، چونکە ئەو چێژی وەرگرتووە لەو ژیانەی -کە مولحید بڕوای وایە دوای ئەوە ژیانێکی تر نیە- بە پێچەوانەی ستەملێکراوەوە کە بێبەش کراوە لەو چێژە.

**جۆری سێیەم:** لە ڕێگەکانی دواندنی عەقڵەکان بریتیە لە گرنگیدان بە قسەکردن لەسەر عەقڵ لەو ڕووەوە کە عەقڵ سەرچاوەیەکی مەعریفەیە و سنووری ئیشی و پەیوەندیی نێوان عەقڵ و نەقڵ و هەڵوێستی عەقڵ لە ئاست غەیب و نەزانراوەکاندا قسەیان لەسەر بکرێت، هەموو ئەمانە وادەکەن عەقڵ لە شوێنی دروستی خۆیدا دابنرێت و وەرگرتن و لەبەرچاوگرتنی بە دروستی بێت.

ئەمە گەشتێك بوو لە سایەی عەقڵدا، ئێستا دەچین بۆ شێواز و تایبەتمەندییەکی دیکەی گوتاری بانگەوازی کاریگەر کە ئەویش بریتیە لە:

**دووەم:** هۆشیاریی باش سەبارەت بە راستی ئەو پرسیارانەی لە مەیدانەکەدا هەن و دروستیی قسە پێچەوانەکان.

لەوانەیە وتاربێژ یان بانگخواز دەستەوسان رابوەستێت لە دەستنیشانکردنی ئەو بابەتەی کە دەیەوێت لە رێی مینبەر یان کورسیی، یان تەنانەت تۆڕە کۆمەڵایەتیەکەیەوە بیخاتەڕوو، بەڵام ئەو دەستەوسانیە نامێنێت ئەگەر بانگخوازان ئاگایان لە سەرقاڵی گەنجان و ئەو بوارانە بێت کە سەرنجی بیرکردنەوەی گەنجان رادەکێشن، بابەتەکان نوێ دەبنەوەو بیر و بڕواکانیش خێرا لە کێبڕکێی خێرادان، هەرکەس ژیرانە چاو ورد بکاتەوە لەسەر واقیعەکە، دەزانێت کەسی قسە بکات، بە چی قسە بکات، ئەگەر بینی مشتومڕی هزریی لەسەر پرسێکی شەرعیی هەیە، ئەوە با خێرا پاش دەرکەوتنی راستیی گرێ و گۆڵەکە و رۆشنی پرسیارەکە، قسەی خۆی هەبێت تیایدا، پاش ئەوەی گوێ هەبوو بۆ بیستنی قسەکانی و گەنجان گوێقوڵاخ بوون بۆ هەر قسەیەك لەو پرسەدا دەوترێت.

**سێیەم:** رەچاوکردنی بارودۆخی ئەوانەی قسەیان بۆ دەکرێت و جیاوازی ئاستی هەرکامیان، هەروەها بزانێت ئەو شێوازی گوتارانە کامانەن کە گەنجانی مەیدان لەخۆ نزیك دەکەنەوە یان وەڕسیان دەکەن و دووریان دەخەنەوە.

**چوارەم:** بەرامبەر بە بەڵگە، بەڵگە بخرێتەڕوو، نەوەك جنێو و قسەوتن، هەروەها لەگەڵ نەیاردا دادپەروەر بین.

ئەوەی کە کاریگەریەکی خراپ جێدەهێڵێت، ئەوەیە کە بە قسە وتن، یان تۆمەتبارکردنی بەرامبەر، هەوڵ بدرێت بەرنگاری خستنەڕووی گومانێك بین لە ئاست بنەڕەت و چەسپاوە شەرعیەکاندا، بێ ئەوەی دیوی هەڵەی گومانەکە بە بەڵگە و قەناعەت پێهێنان وەڵام بدرێتەوە، ئێمە ئێستا لە سەردەمێکدا دەژین کە ئاستێکی دیاریکراو لە نێوەندی گەنجاندا هەیە بۆ زمانی پەسەندکراو، ئەویش ئەو زمانەیە کە مشتومڕ لەسەر قسە دەکات نەوەك قسەکەرەکە، لەسەر زانیاریی

نەوەك ئەوەی دەیڵێت، بێگومان ناکرێت هەمیشە ئاوا بێت، بەڵام هەرکات گونجا بەو چەشنە بێت و حەقیقەتیش نەفەوتێت، ئەوە ئەم شێوازەیان کاریگەرترە.

هەروەك دادپەروەربوون لە ئاست بەرامبەر و نەیاردا و پاراستنی ئاستی رەوشتبەرزی لەگەڵیدا و تۆمەتبارنەکردنی بە نیازی خراپ، تەنها لەبەر ئەوەی قسەیەکی کردووە کە هەڵەیەکی تێدایە، ئەمە گرنگترین تایبەتمەندیی دروستکردنی کاریگەرییە لە مەیدانی هزریی هاوچەرخدا، تەنها چەند حاڵەتێکی تایبەت دەمێننەوە کە تاك ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر خۆیدا، نموونەیەکی باشتر بۆ ئەوە لەو کەسانە بەدیناکەم کە بە خۆیان دەڵێن قورئانییەکان.

**پێنجەم:** حەزی راستگۆیانە بۆ رێنموونیی خەڵك:

نیەتی دروست و گوڕوتین بۆ بیرۆکە و نیازپاکی لەپێناو خوادا بۆ گەیاندنی و سوودمەندبوونی خەڵك لێی، لەسەر شێوەو دەربڕینەکانی دەموچاو دەردەکەوێت و وا لە تەماشاکار دەکات هەست بە بەها و گرنگیی بکات، پێش ئەوەش خوای گەورە پێگە و قەبوولێك دەبەخشێت بە قسەکانی ئەو کەسە.

## چۆن مامەڵە بکەین لەگەڵ گومانە هزرییە هاوچەرخەکاندا؟

بۆ مامەڵەیەکی چاك لەگەڵ ئەم شەپۆلی گومانانە، پێویستە لە سێ بەرەوە ئیش بکەین:

برەی بەرگریی بۆ ئەوانەی پێی کاریگەر نەبون، بەرەی چارەسەر بۆ ئەوانەی پێی کاریگەر بون، بەرەی گفتگۆ و مشتومڕ لەگەڵ ئەوانەی گومانەکان دەورووژێنن.

بۆیە لە لاپەڕەکانی تردا بەپێی چەند بنەمایەکی مەنهەجیی بۆ هەرکامیان، باسی هەریەك لەو سێ بەرەیە دەکەم، ئەویش بەم چەشنە:

**یەکەم:** چەند بنەمایەکی خۆپارێزیی لە گومانە هزرییە هاوچەرخەکان.

**دووەم:** بنەماکانی مامەڵە لەگەڵ گرێ و کێشە و گومانەکان پاش ئەوەی دێن.

**سێیەم:** چەند بنەمایەکی گفتگۆیی و بەهرەی جەدەلیی بۆ مشتومڕ لەگەڵ ئەوانەی گومانەکان دەورووژێنن.

یەکەم: چەند بنەمایەکی خۆپارێزیی لە گومانە هزرییە هاوچەرخەکان.

### بنەمای یەکەم: بەهێزکردنی دڵنیایی سەبارەت بە بنەڕەتەکانی ئیسلام:

پاش تێکەڵبوون لەگەڵ واقیعی ئەو پرسیارانەی گەنجان دەیانکەن، گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە پێویستە گرنگیەکی زۆر بدرێت بە خستنەڕووی بەڵگەکانی بنەڕەتی ئیسلام بە شێوەیەکی عەقڵیی وا کە ئیمان زیاد بکات و دڵنیایی بەهێز بکات و دڵ بپارێزێت لە رەشەبای گومانەکان، ئەگەر دڵ دڵنیایی نەبێت لەئاست ئەو بنەڕەتانە و بەڵگەکانی نەزانێت، ئەوە زوو تووشی گومان دەبێت و زۆر نابات، شێوان رووی تێدەکات.

ئەم پرسە هاودەم بەوەی لە قورئاندا زۆر گەورە باسی هاتووەو زۆریش پێویستمان پێیەتی، بەڵام بەو جۆرەی کە پێویستە گرنگیی پێ نەدراوە، بۆیە شتێکی نامۆ نیە کە نەوەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی بکەونە ژێر کاریگەریی ئەو شەپۆلە گومانسازیانەی کە گومان دەخەنە سەر بوونی خوا، یان کتێبەکانی خوا، یاخود پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت.

لەبەر گرنگیی ئەم بنەما خۆپارێزیە، باسی هەندێ هۆکاری زانستی دەکەم کە پاڵپشتیی ئەم بنەمایە دەکەن.

## هۆکارەکانی بەهێزکردنی دڵنیایی:

**یەکەم:** زیندووکردنەوەو بڵاوکردنەوەی پەرستشی رامان و بیرکردنەوە لە ئایەتە گەردوونیەکانی خوا.

لە قورئانی پیرۆزدا پەیوەندیی نێوان بیرکردنەوەو درك کردن بە راستیە گەورەکان روونکراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت (الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)،[(١)] (ئەو کەسانەی کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو بە دانیشتن و بە راکشانەوە لەسەر لایەکانیان، بیریش ئەکەنەوە لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و دەڵێن پەروەردگارا! تۆ ئەم زەوی و ئاسمانانەت بێهوودە بەدینەهێناوە، پاك و بێگەردیی بۆ تۆ، خوایە! لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە).

ئەو کەسانە پاش بیرکردنەوە، بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوییان بە بەڵگە زانیوە هەتا نکوولی هیچگەرایی و هەرلەخۆوەبوون بکەن.

هەروەها دەبینین لە رامان و تێفکرین لە نەفس و ئاسۆکانەوە، دەگەینە ئەو دڵنیاییەی کە قورئان راست و دروستە (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ)،[(٢)] (ئێمە نیشانەی تاك و تەنهایی خوایان پێ نیشان دەدەین

---

(١) - آل عمران: ١٩١.

(٢) - فصلت: ٥٣.

لە لووتكە و ئاسمان و لە خودی خۆیشیاندا هەتا بۆیان دەربکەوێت ئەم قورئانە حەقە و لای خوای گەورەوە هاتووە).

خوای گەورە سەرکۆنەی ئەو کەسانە دەکات کە وازیان هێناوە لە بیرکردنەوە لە ئایەتە گەردوونیەکانی ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾،[1] (ئاسمانیشمان داناوە بە سەقفێکی پارێزراو، لەکاتێکدا ئەوان پشت لە ئایەتەکانی خوا ئەکەن).

هیوادارم شارستانیەتی نوێ هۆکاری ئەوە نەبێت ڕێمان لێبگرێت لە پەرستشی بیرکردنەوە لە ئاسمان و ئەستێرەکان و نەفس و ئاژەڵان.

لە پێناوەکانی زیندووکردنەوەو بڵاوکردنەوەی پەرستشی بیرکردنەوەش بریتین لە:

**أ:** بڵاوکردنەوەی ئەو کەرەستە بینراو و خوێندراوانەی کە خزمەت دەکەن بە بواری رامان و بیرکردنەوە.

زۆرێك لە کەرەستە بینراوەکانی پەیوەست بە گەردوون و مرۆڤ و ئاژەڵ و دەریاکان، یارمەتیدەرن بۆ بیرکردنەوە لە بەڵگەکانی خوا، یەکێك لەو کەسانەی هەوڵیداوە لە بەرنامەکەیدا بە جوانی ئەمە نیشان بدات، د.موستەفا مەحموود بوو رەحمەتی خوای لێ بێت، ئیشەکەشی کاریگەریەکی باشی هەبوو.

**ب:** ئەنجامدانی پێشبڕکێ لەسەر باشترین بەرهەمی بینراو یان توێژینەوەی نووسراو لەو بوارەدا.

**ت:** ئەنجامدانی پێشبڕکێی پرسیار و وەڵام، یان پوختکردنەوەی بابەتە بڵاوکراوەکانی پێشووتر لەو بوارەدا.

**دووەم:** هۆکاری بەهێزکردنی دڵنیایی بریتیە لە بڵاوکردنەوەی پەرستشی بیرکردنەوە لە ئایەتە شەرعیەکانی خوا و بەستنەوەی خەڵك بە قورئانەوە، خوای گەورە قورئانی دابەزاندووە بۆ ئەوەی مرۆڤ ڕێنموونی بکات بۆ ئەو ئامانجەی

---

(١) - الأنبياء: ٣٢.

کە لە پێناویدا بەدیهێنراوە، هەروەها بۆ ئەوەی خوا بناسێنێت بە بەندەکانی و هەواڵی زیندووبوونەوەو لێپێچینەوەو پاداشت و سزای ڕۆژی دواییان پێ بدات، بە بەڵگەی ڕوون و یەکلاکەرەوەش ئەوەیان بۆ بسەلمێنێت، بەردەوام قورئان گومانەکان دەشواتەوەو دڵنیایی بەهێز دەکات و ڕۆحی ئیمان لە دەروونی ئەوانەدا دادەنێت کە خوای گەورە خێر و چاکەی دەوێت بۆیان.

لە ئێستادا هەوڵی زۆر جوان هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی پەرستشی ڕامان لە قورئان و گەیاندنی تەفسیری قورئان بە خەڵك، لەوانەش ئەو هەوڵەی کە ناوەندی (تەدەبور) و ناوەندی (تەفسیر) لەو بوارەدا پێشکەشی دەکەن، خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە.

**سێیەم:** بایەخدان بەو کتێبانەی گرنگیی دەدەن بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەکانی ڕاستی و دروستی بنەڕەتەکانی ئیسلام، زانایانی پێشوو و ئێستایش لەو بوارەدا نووسینیان هەیە، دەبینین زۆرێك لە زانایانی پێشوو لە بواری ئیعجازی قورئاندا کتێبیان نووسیوە وەك خەتتابی و ڕومانی و باقەلانی و جورجانی، لە باسی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیشدا نموونەی زیاتر دەبینین، وەك نووسینەکانی ئەبوونوعەیمی ئەصبەهانی و قازی عەبدلجەببار و بەیهەقی و چەندینی تر، بەڵام لێرەدا ئاماژە دەدەم بە چەند کتێبێکی هاوچەرخی تایبەت بەم بوارە کە دەکرێت لە بەرنامەی خوێندنەوەی بەکۆمەڵدا بە ڕیز بخوێنرێنەوە، یان بخرێنە چوارچێوەی پێشبڕکێیی پوختکردنەوەی کتێبەوە.

کتێبی (النبأ العظيم) ی موحەممەد عەبدوڵا دەراز، کتێبێکی زۆر جوانە و بە چەند دەستەواژەیەکی باڵای ئەدەبیی و چەند دەربڕینێکی ڕوونکەرەوەی وا کە هەست و ویژدان بجووڵێنێت، باس لە بەڵگەکانی ڕاستی و دروستی قورئان و ڕاستگۆیی پێغەمبەر موحەممەد دەکات، کتێبێکی تریشی هەیە لەسەر هەمان بابەت بەناونیشانی (مدخل الى القرآن الكريم).

کتێبی (براهين و أدلة إيمانية)ی عەبدوڕەحمان حەسەن حەنبەکەتولمەیدانی ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

ASTANA

کتێبی (نبوة محمد من الشك إلى اليقين) لە نووسینی فازڵ سامەڕائی.

کتێبی (الأدلة العقلية النقلية على أصول الإعتقاد ) ی سعود العريفی، کتێبێکی گەورەیە لە ئاستێکی باڵای داڕشتنی زانستیدا.

کتێبی (کامل الصوره) کە بەشی دووەمیەتی.

لە هۆکارەکانی بەهێزکردنی دڵنیایی:

**چوارەم:** گرنگیدان بە قسەکردن لەسەر خوا و سیفەتەکانی و گەورەیی و تاك و تەنهایی خوا لە گوتاری بانگەوازیدا.

باسی یەکخواپەرستیی ئولوهیەت لە وانەی بیروباوەڕی ناوچەییدا، پشکێکی گەورەی گرنگیپێدانی بەرکەوتووە، ئەمەش کاریگەریەکی زۆر باشی هەبووە لەسەر هۆشیاریی خەڵك بۆ ئەو بابەتە، بەڵام یەکخواپەرستیی ربووبیەت ئەو بایەخەی پێ نەدراوە کە دەبوو پێی بدرێت، لەکاتێکدا قورئانی پیرۆز پڕە لە باسی خوای گەورە و ناو و سیفەت و کردارەکانی زاتی الله، بەڵکو یەکەم ئایەتی قورئان کە دابەزی ئەمە بوو (اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ)، (بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە، مرۆڤی لە دڵۆپە ئاوێکەوە بەدیهێناوە کە دواتر بووە بە خوێنێکی مەییو، بخوێنە بەناوی پەروەردگاری هەرەبەڕێزتەوە)، پێویستیی ئێستا وا دەخوازێت قسە لەسەر ئەو بابەتە بکرێت و بە هۆکاری جیاواز و لە بەشەکانی گوتاری بانگەوازیدا قۆناغ بە قۆناغ ئیشی لەسەر بکرێت.

**پێنجەم:** گرنگیدان بە پەرستشی دڵەکان لە بانگەواز و زانست و کرداردا.

ئیبراهیمی خەلیل تەواو پشتی بە خوا دەبەست و خشووعی بۆ خوای گەورە هەبوو و یەقین و دڵنیاییشی هەبوو، جا کاتێك خەڵکەکەی سەبارەت بە خوای گەورە مشتومڕیان لەگەڵ دەکرد، پێی فەرموون (قَالَ أَتُحَاجُّونِّي فِي اللَّهِ وَقَدْ هَدَانِ)، (وتی: ئەرێ مشتومڕم لەگەڵ دەکەن سەبارەت بە خوای گەورە کە ڕێنموونی کردوم؟).

ئەوان نەیاندەزانیی ئەو پێغەمبەرە دڵ  و سنگی پڕە لە دڵنیایی و رووناکی و ناسینی خوا، هیچکات ئەو بەخششە ئیمانیە ناگۆڕێتەوە بە هیچی دی، مەگەر ئاسایش ئەگۆردرێتەوە بە ترس و بیم؟ مەگەر ئارامی دەگۆردرێتەوە بە بارگرژی؟

بۆیە لە ئایەتی دواتردا ئەمە دەخوێنینەوە (فَأَيُّ الْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِالْأَمْنِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ)، (ئایا کام لەو دوو کۆمەڵە شیاوترن بەوەی ئەمین و پارێزراو بن لە سزای خوا، ئەگەر ئێوە بەڵگەکان ئەزانن و حەق و باتڵ لەیەك جیا ئەکەنەوە).

دەربڕینێکی بەناوبانگی یەکێك لە خواناسانی پێشوو هەیە کە تیایدا دەڵێت: ئەگەر پادشاکان و شازادەکان دەیانزانی ئێمە لە چ خۆشگوزەرانیەکداین، بە شمشێر لەسەری بەرنگارمان دەبوونەوە)، پێتان وایە کەسێك ئەو هەستەی هەبێت و گومان کاری تێ بکات؟

هاوکێشەیەکی جوانی ئیمانیی هەیە کاتێك هیرەقل باسی کرد، ئەو دەمەی سەبارەت بەو کۆچەری و پشتیوانانە پرسیاری لە ئەبووسوفیان کرد کە لە دەوری پێغەمبەری خوان، ئایا کەسیان هەیە پاش ئەوەی موسڵمان بوویێت، لەتاو تووڕەیی و بێزاری لە دینەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوە؟ ئەبووسوفیان کە ئەوکاتە بێباوەڕ بوو، وتی: نا، هیرەقل وتی: دەی ئیمان ئاوایە، کاتێك تام و چێژەکەی تێکەڵ بە دڵەکان دەبێت، کەس لێی بێزار نابێت.

خۆپاراستن لە گومانەکانی کوفر و گومان و ئیلحاد دڵێك ناگرێتەوە کە چێژی شیرینی ئیمانی نەکردبێت، چونکە ئەگەر دەستی لێ هەڵگرێت، هەرگیز هەست بە خەسارەت و لەدەستدان ناکات، بەڵام ئەوەی تامی ئیمانی کردبێت، هەرگیز بە هیچ لەبرێتیەکی تر -بەدیل- رازی نابێت، لەبەر هەموو ئەمانە، بایەخدان بە بەهێزکردنی ئیمانی دڵ و پەیوەستکردنی بە پەروەردگار و پشت پێ بەستنی و خۆشەویستی و لەخواترسان و پاڕانەوەی لە خوا، لە گەورەترین هۆکارەکانی خۆپاراستنە لە گومانەکان، دەی کوا ئەم پرسە لە گوتاری ئێمەدا ئامادەیی هەیە؟ ئایا ئەو بایەخەمان پێ داوە کە شیاویەتی؟ مەگەر لە قورئانی پیرۆز و گوتاری پێغەمبەری خوا و وتەی زانایاندا گرنگیەکی راستەقینەی پێ نەدراوە؟

جێی گومان نیە کە زۆربەی گومانەکان بەهۆی لاوازی ئیمان و تامنەکردنی شیرینی باوەڕەوەیە، بۆیە پێویستمان بەوەیە پێداچوونەوەیەك بکەین بە ئیمان و دڵ و کردار و راستگۆییمان لەگەڵ خوای گەورە، هەموو ئەمانەش خۆپارێزیی و بەرگریەکی بەهێزن دژ بە ئەو جەنگەی هزرییەی بەرامبەر ئیسلام و بنەڕەتە چەسپاوەکانی بەرپا دەکرێت.

لەو کتێبانەی گرنگییان داوە بەم بوارە، کتێبەکانی پێشەوا ئیبنولقەییمە رەحمەتی خوای لێ بێت، بە تایبەت کتێبی (مدارج السالكين)، زۆربەی سۆفیگەراکان و کەسانی پەرستشکار دڵیان داوە بەو کتێبە و قسەیان لەبارەیەوە هەیە.

**شەشەم:** بەسەرهاتی ئەوانەی تازە موسڵمان بون، چونکە ئەوەش کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر چالاکبوونی ئیمانیی، بەتایبەت کاتێك دەبینیت تایبەتمەندییان هەمەچەشن و وڵاتیان جیاوازە، ئەوانە لە قەناعەت و رەزامەندی خۆیان و هەستکردن بە چاکترینەوە هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەو هەڵمەتی شێواندنە سەختەش هەیە کە دژ بە ئیسلام و موسڵمانان پەیڕەو دەکرێت، کەچی دەبینین رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتیەکانیش بەردەرگای ئیسلامیان قەرەباڵغ کردووە.

جوانیی نێو بەسەرهاتی ئەو تازە موسڵمانبوانە ئەوەیە کە لەسەر هەندێ واتای ئیمانی وا رامانده‌وەستێنن کە لەوانەیە ئێمە لەدەستمان دابان، چونکە ئەوان بە چاوی تامەزرۆیی و دڵێکی تامەزرۆ بە گەیشتن بە واتا و تێگەیشتن لە فەرمایشتی خوا قورئان دەخوێننەوە، ئەوان پێشتر تاڵاوی کوفر و سەرگەردانییان چەشتووە، کاتێك تەماشای ئەڵقەکانی بەرنامەی (بالقران اهتديت) ی فەهد کەندەریم دەکرد (خوای گەورە تەوفیقی بدات)، دەبینم یەکێکە لە جوانترین بەرنامەکانی ئەو بوارە، پێشنیاری ئەوە دەکەم ئەو ئەڵقانە لە بەرنامە خێزانی و خوێندنگەییەکاندا نیشان بدرێن و بڵاوبکرێنەوە بۆ ئەوەی ئامانجی بەهێزکردنی دڵنیایی بێتەدی.

ASTANA

### بنەمای دووەمی خۆپارێزیی: دروستکردنی عەقڵی ڕەخنەگرانە:

عەقڵی ڕەخنەگرانە ئەو عەقڵەیە کە پشکنین دەکات، بەبێ بەڵگە بانگەشە قبووڵ ناکات، بەڵگەی نارەوا و خراپیش پەسەند ناکات، هەڵەی مەنتیقیش بەسەریدا تێناپەڕێت.

زۆرێك لەو گومانانەی بەرامبەر توێژی گەنجان دەوروژێنرێن، کاریگەرترین هۆکار کە وادەکات کاریگەرییان هەبێت، بریتیە لە نەبوونی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە و عەقڵیەتێکی پشکنەرانە، بۆیە گرنگیدان بە چاندنی واتا و مەبەستی بیرکردنەوەی دروست، بیرکردنەوەیەك کە بتوانێت وەرگیراو و بەرپەرچدراوەی زانیاریەکان لێك جیابکاتەوە، بە بابەتێکی زۆر گرنگ دادەنرێت لە خۆقایموقۆڵکردن لە ئاست گومانەکان و بەهێزکردنی بەرگریی هزریدا.

زانایانی ئیسلام زۆر گرنگییان بەوە داوە پێش ئەوەی زانیارییەك پەسەند بکەن، پشکنین و وردبینی بۆ بکەن، لە دیارترین نموونەکانیش ئەو وردەکارییەیە کە زانایانی فەرموودە خولگەیەکی پشکنینی سەرسوڕهێنەریان بەرهەمهێناوەو بەو خولگە پشکنەرە، ڕەخنەیان گرتووە لە گێڕەرەوانی فەرموودە و تەنها بە ڕووکەش هەڵنەخەڵەتاون، بەراوردی گێڕانەوەکانیان کردووەو هەرچی مونقەتیعە بە لاوازیان داناوە، کەسە درۆزنەکانیان ئاشکرا کردون، هەتا ئەو ڕێبازە ڕەخنەییان بوو بە پارێزەرێك بۆ سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەروەها زانایانی موسڵمان گرنگییان داوە بە باسکردنی بنەماکانی جەدەلی دروست و دیبەیت و گفتگۆی بەرهەمدار، باسی بەڵگە پەسەندکراوەکان و بانگەشە بەرپەرچدراوەکانیان کردووە، ئەمانەو چەندین شتی تریش کە پێویست دەکات پشکنین و وردبینییان بۆ بکرێت لە کتێبەکانی (هونەری توێژینەوەو دیبەیت) یان (زانستی جەدەل) دا خراونەتە بەرباس.

ئەمەی پێشوو جیاوازە لەو عەقڵیەتە گومانگەرای کە سەرمەستە بە (نازانم) و (لەوانەیە) و (چووزانم)، چونکە عەقڵی ڕەخنەگربەپێی ئاستی بەرپەرچدانەوەو

گومانکردن لە هەواڵ و زانیارییەکان نیە، بەڵکو بەپێی تێبینیکردنی ئەو هۆکار و بەڵگانەیە کە وا دەخوازن شتێك بەرپەرچ بداتەوە یان وا دەکەن شتێك پەسەند بکرێت.

بێگومان پێویستمان بە خول و وانە و جێبەجێکردنی کرداریی تایبەت بەو بوارە هەیە بە چەشنێك رێنموونیمان بکات بەرەو پەیرەوی دروستی بیرکردنەوەی رەخنەگرانە و جیاکردنەوەی ئەم مۆدێلە لە بیرکردنەوەی نەرێنی گومانگەرا، دەتوانین منداڵەکانمان پەروەردە بکەین لەسەر بیرکردنەوەی رەخنەگرانە، ئەویش بە پەیڕەوکردنی بەسەر ئەو هەواڵ و راوبۆچوونانەی کە لە خوێندنگە و لەنێو هاوڕێکانیاندا دەیانبیستن، بەو چەشنە بە دادگاییکردنی ئەو هەواڵ و زانیاریانە، رادەهێنرێن لەسەر بنەمای پشتڕاستکردنەوەو شرۆڤەی تەندروست.

هۆکارێکی یارمەتیدەری بەهێزکردنی پێناوەکانی عەقڵی رەخنەگرانە، بریتیە لەوەی شارەزاییت هەبێت بە شێواز و تواناکانی لێکۆڵینەوەی زانستی، عەقڵی رەخنەگر پێویستی بەوەیە شارەزای سەرچاوەکانی زانیاریی بێت و بزانێت بۆ وردبینی و چەسپاندن، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بۆیە پێویستمان بەوەیە سەبارەت بە چۆنێتی گەڕانی ئەلیکترۆنی و پەڕەیی بۆ زانیاریەکی نێو سەرچاوە متمانەپێکراوەکان، هەروەها چۆنێتی گەڕان بۆ راستی فەرموودە لە ئینتەرنێت و لەنێو کتێبەکاندا، خولی تایبەت ببینین.

## بنەمای سێیەمی خۆپارێزیی: تەئصیلی شەرعی:

مەبەست بە تەئصیلی شەرعی لێکۆڵینەوەیە لە بنەڕەتی هونەرە شەرعییەکان (بیروباوەر، فیقهـ، ئوصولی فیقهـ، موستەلەح، زمان، زانستەکانی قورئان)، ئەمەش زۆر گرنگە، چونکە بنەرەتێکی پتەوی مەعریفی لای فێرخواز پێکدەهێنێت کە پەنای بۆ دەباتەوەو پشتی پێ دەبەستێت، بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی کە ئەم بنەڕەتەیان نیە، بناغەیەکی پتەو و بەهێزیان نیە.

ئەوەی هاوکارە لە بڵاوکردنەوەی ئەم بوارە خۆپارێزیەدا، بریتیە لە ئاسانکردنی زانستە شەرعییەکان و نزیککردنەوەیان لە گەنجان و پێشکەشکردنیان لە چەند

خولێکی کورتدا و بە شێوازی نوێ و پێناوی فێرکاریی دیاریکراو، با هەرکەس ئەم کارە دەکات، وا خۆی دابنێت کە رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە خۆپارێزی لەئاست گومانە هزرییە هاوچەرخەکاندا.

لەو هەوڵە چاکانەی لەم بوارەدا پێشکەش کراون، هەوڵەکەی دکتۆر عامر بەهجەتە لە خولە تایبەتەکانی لە بواری فیقهوئوصولی فیقهدا، خولەکانیش لە ماڵپەری یوتیوبدا بە ناونیشانی (تنبیه الفقیه) و (الطریق الی أصول الفقه) و چەندین ناونیشانی تر دانراون.

لەو بوارە مەنهەجیە گرنگانەی کە بۆ ئەم قۆناغە پێویستن، بریتیە لە گرنگیدان بە چەسپاندنی بنەڕەت و چەسپاوەکان لە وانەی شەرعیدا و نەوەستان لە ئاستی شەرحی دەقەکان، یان قسەکردن لەسەر دەقەکان و دارشتنەوەی دەقەکانی، بەڵکو پێویستە ئەوەشی بۆ زیاد بکرێت کە بە شەرح و روونکردنەوە، دروستی بنەڕەتەکانی ئەو پرسە بەمەبەست گیراوانە بچەسپێنرێت، چونکە پشتبەستن بە بەشداریی گوێگر و قسەکەر لە خۆبەدەستەوەدان لە ئاست دروستی ئەو بنەڕەتەی کە شەرح کراوە، لە قۆناغی پێشوودا بووە کە جیاوازە لەم قۆناغەیان، لەمەیاندا شەپۆلی پرسیارەکان رووەو بنەڕەت و چەسپاوەکانە، ئەمەش وا دەخوازێت زانستخواز هەم لە دەربڕینەکانی فیقهناسان و بنەماکانی ئوصولی و فەرموودەناسان تێبگات، هەم بەڵگەی دەست بکەوێت لەسەر راستی و دروستی بنەڕەتی ئەو دەقانە.

ئەگەر کەسێك بڵێت: ئەو کەسەی ئامادەی وانە شەرعییەکانە، ناکەوێتە ژێر کاریگەریی گرێ و کێشە وروژێنراوەکانی دژ بە بابەتە چەسپاوەکان، ئیتر چ پێویست بەوە دەکات ئەم بابەتەت باسکرد؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە زانستخواز هەرچەندە دووربێت لە کاریگەری گرێ و کێشە و گومانەکان، هێشتا ناتوانێت بێمنەت بێت لە زانینی بەڵگەکان و راستی بنەڕەتەکان، بۆ ئەوەی بتوانێت وەڵامی ئەو رەخنەو گومانانە بداتەوە کە ئاڕاستەی دەکرێت -مەگەر ئەوەی کەسەکە بیەوێت کەنار بگرێت لە خەڵك و خۆی بەدووربگرێت لە سەرقاڵی ئەو خەڵکە و خۆسەرقاڵکردن پێیانەوە-.

ئەوەی بێ هیچ گرفتێك ئەم ئامانجە دێنێتەدی، بریتیە لە گرنگیدان بە پێشکەکردنی دەروازەی زانستەکان پێش ئەوەی دەست بکرێت بە شەرحەکان، ئەو دەروازانەش بەڵگەی گشتی وا لە خۆبگرن کە دروستیی بنەڕەتەکانی زانستی ئەو وانەیە بسەلمێنێت و باس لەوە بکات هۆکاری گرنگییپێدانی چیە و ئەو شوێنەوارە نەرێنیانە چین کە ئەگەر دەستی لێهەڵبگرێت و خۆی لێ دووربگرێت و لێی بێمنەت بێت.

## بنەمای چوارەم: دیاریکردنی سەرچاوەکانی وەرگرتن و مەعریفە و هەڵوێست لە ئاست هەر سەرچاوەیەکدا:

ئەو سەرچاوانە چین کە بۆ پێکهێنانی مەعریفە پشتیان پێ دەبەستین؟ سنووری هەر سەرچاوەیەك کامەیە؟ ئایا دەستتێوەردانی تێدایە؟ سەرچاوەکانی وەرگرتنی شەرعیی چین کە هەڵەیان لێ ناکەوێتەوە؟ سەرچاوەکانی سوودوەرگرتنی شەرعیی چین کە دەکرێت هەم هەڵە و هەم پێکانیشی تێدا بێت؟

هەموو ئەم پرسیارانە بۆ ئەم نەوەیە گرنگن، ئەگەر بە شێوەیەکی دروست وەڵام پێشکەش کرا، ئەوە عەقڵ رێکدەخات و ئەو دەروازە و دەرچانە روون دەکاتەوە کە بۆ پێکهێنانی مەعریفە پشتیان پێ دەبەسترێت، ئەمەش پێناوێکی خۆپارێزییە کە لەم کاتەدا پێویستمان پێیەتی.

لە گەورەترین هۆکارەکانی بارگرژیی هزریی هاوچەرخ، لادانە لە بواری سەرچاوەکانی مەعریفەدا، چنکە زۆربەی مولحیدەکان -بەتایبەت لە جیهانی رۆژئاواییدا- بەرامبەر بەو سەرچاوانەی کە مرۆڤ مەعریفەیان لێوە وەردەگرێت هەڵوێستی نەرێنییان هەیە، تەنها هەست و ئەزموون نەبێت کە زیادەڕەویی تێدا دەکەن و بە تاکە سەرچاوەی بەدەستهێنانی مەعریفەی دادەنێن، ئەمە وایلێکردون ئەو بەڵگە عەقڵییانە بەرپەرچ بدەنەوە کە بوونی خوا دەسەلمێنن و پشت نابەستن بە هەستی راستەوخۆ و ناچنە نێو بازنەی زانستە ئەزموونییەکانەوە، وێڕای ئەوەی ئەو زانستانەی وەحی بەرپەرچ دەدەنەوە کە سەرچاوەکەیان هەواڵی راستە، هەواڵێك کە لەسەر بنەمای بەڵگەی عەقڵیی پێشوەختە دامەزراوە، زۆربەی مشتومڕە

هزرییەکانی نێوان باوەڕداران و مولحیدەکان، تیایدا دەست دەبرێت بۆ بڕێك بابەتی پەیوەست بە مەعریفە، بۆیە گرنگیدان بە تێگەیشتن لە بیردۆزەی مەعریفە و لقەکانی، لە گرنگترین ئەو بابەتانەیە کە پێویستە توێژەری موسڵمانی هاوچەرخ گرنگیی پێ بدات.

هەرکەس دەیەوێت بیرۆکەیەکی تایبەت سەبارەت بە مەعریفە و سروشت و سەرچاوەکانی وەربگرێت، ئەوە مامۆستا عەبدوڵا عوجەیری لە کەناڵی یوتیوب وانەیەکی بینراوی هەیە بە ناونیشانی (مدخل لفهم نظرية المعرفة)، لە قۆناغی یەکەمدا بۆ ئەوە گونجاوە کە تێڕوانینێکی گشتی لە ئاست ئەو بیردۆزەیە و پەیوەستییەکانی و سروشتی مەعریفە لە ئیسلامدا وەربگریت، پاشان باشترە دەست ببرێت بۆ کتێبی (مصادر المعرفة في الفكر الديني و الفلسفي) لە نووسینی دکتۆر عەبدوڕەحمان بن زەیدی زنیدی، پاشان کتێبی (المعرفة في الإسلام) ی دکتۆر عەبدوڵا قەرەنی کە کتێبێکی تایبەتە، بەڵام ئەوەی هەیە بۆ کەسەی سەرەتایی و قۆناغی ناوەندی، قورسیەکی تێدایە، ئینجا بچیتە سەر کتێبەکەی دکتۆر عەبدوڵادعجانی سەبارەت بە هەڵوێستی ئیبن تەیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەبارەت بە مەعریفە، لە ژێر ناونیشانی (منهج ابن تيمية المعرفي) کە نامەیەکی جوان و بەسوودە، ئەمەش بۆ هەردوو قۆناغی سەرەتایی و مامناوەندی، قورسیەکی تێدایە.

هەروەك بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانەی پێشوو، دەتوانین جیاوازی بکەین لەنێوان سەرچاوەی شەرعیی بێ پەڵە و سەرچاوەی بەپەڵە، لەمەوە قورئان و سوننەت هیچ هەڵەیەکیان لێ دەرناچێت، هەروەها کۆدەنگیی تێگەیشتنی زانایانی موسڵمان لەسەر بابەتێکی دیاریکراو شەرع – ئەگەر سەلما ئیجماع و کۆدەنگیی لەسەرە-، بەڵام تاکی ناو زانایان، بگاتە هەر پلەیەکی زانستیش، ناگاتە ئەو ئاستەی هەرچیەك دەیڵێت دروست بێت، با تەنانەت ئەو کەسە ئەبووحەنیفە و مالیکی کوڕی ئەنەس، یان شافیعی یاخود ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش بێت، ڕەحمەتی خوا لە هەموویان.

ئەوەی دەچێتە چوارچێوەی ئەو بنەما گرنگەوە، مەسەلەی خۆبەدەستەوەدانە بۆ دەقی شەرعی و پشتی بە چ شتێك بەستووە، لە سەرچاوە گرنگەکانی بواری خۆبەدەستەوەدان، بریتیە لە کتێبی (ینبوع الغوایە) ی عەبدوڵا عوجێری و کتێبی (التسلیم للنص الشرعي) ی فەهد عەجلان.

**بنەمای پێنجەم: کەسانی ناپسپۆڕ دەست نەبەن بۆ گوتاری گومانەکان:**

گرنگە ئەو کەسەی پسپۆڕیی وەردەگرێت لە وەڵامدانەوەی گومانەکاندا، شارەزا بێت بە وردەکاریەکانی گومانەکە و ئەوانەی وتوویانە و مێژووی گومانەکەش بزانێت، لەوانەیە پێویست بکات هەندێ کتێبیشیان بخوێنێتەوە، یان بچێتە ناو پێگە و پەڕە ئەلیکترۆنیەکانیان، بۆ ئەوەی بتوانێت بە چاکی وەڵامیان بداتەوە، بەڵام کەسێك کە پسپۆڕیی نەبێت، ئەگەر بچێتە جیهانی گومانەکانەوە، ئەوە پارێزراو نابێت لە سەرەنجامە مەترسیدارەکانی، مەبەستم بە چوونە ناو ئەو جیهانە، زانینی وەڵامی دیارترین گومانەکان و بابەتی پەیوەست بەو بوارە نیە، بەڵکو مەبەستم خوێندنەوەی کتێبی گومانسازەکان یان تەماشاکردنی جریوەکانیان و بەشداریکردنە لە پەڕە کۆمەڵایەتیەکانیاندا، ئیتر لەژێر ناونیشان (زانینی ئەوەی لای کەسانی تر هەیە) بێت، یان لەژێر ناوی کات بەسەربردن بێت، یاخود بەناوی رۆشنبیریی گشتی و چشتی لەو چەشنەوە.

کەسی وا دەناسم کە بە پاڵنەرێکی چاکەوە چووەتە ناو پەڕە و هەژمارە ئیلحادیەکانەوەو دواتر کاریگەریەکی نەرێنی زۆری لەسەر دروست کردووە، کاریگەرییەك کە پێشتر نەیدەویست و چاوەڕوانیشی نەبوو، ئەمەش ئەو هۆشیاریدانەی پێشینی چاکمان وەبیردێنێتەوە کە هۆشیارییان پێداوین گوێ لە بیدعەکاران نەگرین، چونکە وەك زەهەبی (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت، دڵەکان لاواز و گومانەکانیش فڕێنەرن.

## بنەمای شەشەم: خوێندنەوەی خۆپارێزیی لە کێتبەکانی وەڵامدانەوەی گومانەکاندا، بەم مەرجانە:

**أ:** گومانەکان بڵاو و سەردەمیانە بن، یان بە دەستەواژەی سەردەم: لە بازنەی مەترسیدا بن.

**ب:** لەو کتێبانەدا بێت کە بە پوختی باسی گومانەکە دەکەن و بە دووروودرێژی وەڵامی دەدەنەوە، نەوەك بە پێچەوانەوە، چونکە هەندێ نووسەر درێژە دەدات بە باسی گومانەکە و بەڵگە و بنەڕەتەکانی دەخاتەڕوو، ئەمەش بۆ کەسانی پسپۆڕ چاکە، بەڵام ئێمە لێرەدا باس لە خۆپارێزیی کەسانی ناپسپۆڕ دەکەین، بۆیە خوێندنەوەی دووروودرێژی گومانەکان و باسکردنی بەڵگەکانی گومانەکە بە وردی، پێویست ناکات.

**ت:** وەڵامەکە بەهێز بێت، ئەمەش پسپۆڕان دەیزانن و بڕیاری لەسەر دەدەن.

لەو کتێبانەی لە بواری وەڵامدانەوەی گومانەکانی سەردەمدا گونجاون و وەك خۆپارێزیی دەخوێنرێنەوە، بریتیە لە کتێبی (السنة ومكانتها في التشريع الإسلامي) ی موستەفا سباعی و کتێبی (كامل الصوره) بە هەردوو بەرگەکەیەوە.

## بنەمای حەوتەم: ریزکردنی قووچەکی ئامانجە گەورەکان بەپێی ویستی خوا:

زۆربەی کێشەو گومانە هاوچەرخەکان سەبارەت بە ئیسلام، هۆکاری سەرهەڵدانیان بەهۆی ناتەواوی قووچەکی پرسە ئامانجدارە گەورەکانە لەلایەن خاوەنەکانیانەوە، مەبەستم بە پرسە ئامانجدارەکان بریتیە لە داخوازییە مرۆییە گەورەکانی وەك پەرستش و سەقامگیریی و ئازادی و بنیاد و بەدیهێنانی ئارەزوو و بەدەستهێنانی سامان و شتی تری لەو چەشنە، ئەگەر پرسی ئامانجدار وەربگرین کە چەندین دەستەو تاقمی ناو مرۆڤایەتی هەن هەرکامیان یەکێکیان پێش ئەوی تر دەخات، ئەوانیش بریتین لە بەدیهێنانی پەرستشی خوا بەو جۆرەی

خوا دەیەوێت (چەقبوونی ڕەحمان) و بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی تەواوەتی و ئازادی ڕەها بۆ مرۆڤ بەو جۆرەی مرۆڤ دەیەوێت (چەقبوونی مرۆڤ)، ئەوەی لەسەروو قووچەکەوە ئامانجی بوون بە چەقبوونی مرۆڤ دادەنێت، ئەوە لەو کاتەی شتێك لەگەڵ حوکم و فەرمانەکانی خوادا نەگونجێت، حەز و ویستی مرۆڤ پێش فەرمانی خوا دەخات، لای ئەو کاری لەپێشینە ئەوەیە کە بەشدارە لە خۆشگوزەرانی و ئازادی و ویست و حەز و ئارەزووی مرۆڤدا، با تەنانەت خراپ و دوور لە فیترەت، یان پێچەوانەی فەرمانی خواش بێت.

ئەو کەسەی کاریگەرە بەم ڕۆشنبیریە کە ئارەزوو و ئازادی مرۆڤ پێش دەخات - ئەگەر سەیری حوکمە ئیسلامیەکان بکات، کە تیایدا شوێنکەوتنی فەرمانەکانی خوا و پەرستشی پەروەردگار پێش هەر شتێکی تر دخات و بەرزی و بڵندیی نێوان مرۆڤەکان لەسەر بنەمای ئاستی لەخواترسی و شوێنکەوتنی نیزامی خوای گەورە دەستنیشان دەکات-، ئەو کەسە کێشەی لەگەڵ حوکمەکانی ئیسلامدا هەیە لەبەرئەوەی لە دیدی ئەوەوە لەگەڵ چەقبوونی مرۆڤدا ناگونجێت، بۆیە سەرچاوەی کێشەکە ناتەوایی ئەو قووچەکەیە کە ڕیزبەندیی لەپێشینەکانی لەسەر ڕیزکردووە.

لێرەوە تێدەگەین کە بەشێکی زۆری کێشە و گومانە وروژێنراوەکان دژ بە هەندێ حوکمی شەرعیی پەیوەست بە بێباوەڕان، وەك سەرانە و سزای کەسی هەڵگەڕاوە، هۆکارەکەی ئەو ناتەواویەی ناو قووچەکەکەیە، ئەگەرچی بەرگی تری بەسەردا درابێت، ئەوەش لە خوێنەر ناشارمەوە کە زۆربەی ئەو پرسیارانەی ئاراستەم دەکرێن و وەڵامیان دەدەمەوە، سەرچاوەکەیان ناتەواوی ناو قووچەکی ئامانجەکانە، چونکە زۆربەیان دەپرسن و نازانن سەرچاوەی گومان و کێشەکە چیە، ئینجا دەکەونە بەڵگە هێنانەوەو وادەزانن ئەوە هۆکار و ناوەندی کێشەکەیە و ئەم شتە لەگەڵ واقیعدا پەیڕەو ناکرێت، ئینجا وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان پێشەکی و ڕێخۆشکەرییەکی زۆری دەوێت، ئەویش تایبەت بە ڕیزبەندی قووچەکی ئامانجە گەورەکان.

لەو کتێبانەی لەم بوارەدا جوان نووسراون، بریتیە لە کتێبی (مآلات الخطاب المدني) ی ئیبراهیم سەکران.

## بنەمای هەشتەم: بەهێزکردنی ئەو بەرنامەی بەکۆمەڵانەی کە لە رووی هزریی و سۆزدارییەوە سوودبەخشن:

هەواداریی گەنج بۆ ئەو بەرنامە بەکۆمەڵیانەی کە گرنگیی و چالاکی گەنج رادەکێشن، ئایا لە بازنەی خێزاندا بێت، یان لە بازنەی هاوڕێیاندا، دەوڵەمەندیەکی مەعریفی و سۆزداریی پێ دەبەخشێت و رێگریی دەکات لە چەندین جۆری خراپە و ناهێڵێت دزە بکاتە نێو بازنە هەوڵ و گرنگیەکانیەوە و دەرفەتی پێ دەدات تواناکی خۆی ئاشکرا بکات، ئینجا هەست بە متمانە و پێناسی خۆی لا دروست بێت، ئەمەش بەربەستێکی دەروونیە بۆ بەرنگاربوونەوەی بیر و هزرە نادروستەکان.

زۆر گرنگە گرنگیی بدەین بە بەرنامە سوودبەخشە خێزانیەکان کە مەیدانی بیر و گفتگۆ دەسازێنن، وەك بەرنامەی خوێندنەوەی بەکۆمەڵ و دواتر مشتومڕ لەسەر ئەو بەشەی بڕیاری خوێندنەوەی دراوە، یاخود ئەو یانە رۆشنبیریانەی کە کەسانی جێمتمانە بەڕێوەیان دەبەن، کەسانێك کە سوورن لەسەر پاراستنی پێناسی ئیسلامی، ئەم جۆرە بەرنامانە و هاوچەشنەکانیان، هەموو ئەمانە یارمەتیدەرن بۆ بەهێزکردنی بەرگریی هزریی و خۆپارێزیی لەدەست گومانە هاوچەرخەکان.

خۆش و جوانیەکی بابەتی هاوڕێیەتی و کاریگەری لە پێچەسپاویدا، ئەوەیە کە هۆکارێکە بۆ بەدیهاتنی چێژی ئیمان، وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە (ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ بِهِنَّ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ : مَنْ كَانَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا ، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلهِ)، (سێ شت هەن هەرکەس ئەوانەی تیادا بێت، تامی شیرینی ئیمانیان پێ دەدۆزێتەوە .. کەسێك کەسێکی دی خۆش بوێت تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت)، هەرکەس تامی شیرینی ئیمان بکات، هەرگیز ئامادەیی ئەوەی نیە بگوازێتەوە نێو تاڵاوی کوفر و گومان و دۆش دامان.

## بنەمای نۆیەم: نزا و پاڕانەوە:

ئێمە وا راهاتوین کەسێك کە دەچێت بۆ سەفەر، نزای بۆ بکەین هەتا خوا لە خراپە و مەترسیەکان بیپارێزێت و بە ساغ و سەلامەتی بیگێڕێتەوە، لە راستیدا هەموومان گەشتیارین لەم ژیانەدا و لە هەر قۆناغێکدا زیاتر نزیك دەبینەوە

لە مردن، ئەو مەترسیانەی ئەگەری ئەوەیان هەیە لەم سەفەرەماندا تووشمان بن، زۆرن، ئێمەش پێویستمان بە چاودێری و پارێزگاری خوایە، گرانبەهاترین شتێکیش ترسمان هەیە لەم سەفەرەماندا لەدەستی بدەین یان زیانی پێ بگات، ئیمانەکەمانە کە دەمانگەیەنێتە ئەوەی خوا لێمان رازی بێت، ئیبراهیمی خەلیل دەیفەرموو (واجنبني و بني أن نعبد الأصنام)، پێغەمبەر موحەممەدیش ﷺ دەیفەرموو (اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ ، وَبِكَ آمَنْتُ ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ ، وَبِكَ خَاصَمْتُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي ، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ ، وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ).[١]

لەنێوەندی گومانەکان و مەترسییەکانی و زۆریی ئەوانەی تیایدا دەکەون، پێویستیەکی زۆرمان بە نزا هەیە هەتا خوای گەورە خۆمان و ژن و منداڵ و نەوەکانمان لە خراپەی گومانەکان بپارێزێت و ئیمان و یەکخواپەرستیمان بپارێزێت.

---

(١) - صحيح مسلم، الرقم ٢٧١٧.

# چەند بنەمایەك بۆ مامەڵە
# لەگەڵ کێشە و گومانەکان پاش هاتنیان

بنەماکانی پێشووی خۆپاراستن لە گومانەکان بۆ ئەو کاتە بوو کە هێشتا گومانەکان نەگەیشتون بە موسڵمان، بەڵام ئەگەر بەرنگاری گومانێك بوویەوە، ئەوە پێویستی بە بنەمای مەنهەجیی زیاتر هەیە هەتا هاوکاری بن بەرامبەر بە گومانەکان هەڵسوکەوتی دروست بگرێتەبەر.

**بنەمای یەکەم: بەکارهێنانی بیرکردنەوەی رەخنەگرانە و توندوتۆڵکردنی زانستی لە مامەڵە لەگەڵ بیر و باوەڕ و زانیارییەکاندا:**

پێویستە هەر زانیارییەك بەهایەکی وای هەبێت شایەنی لێڕامان و مشتومڕ بێت، ئەگەر بێتو کەمترین ئاستی توندوتۆڵیی زانستی تێدا نەبێت، بەڵام ئەگەر بێ جڵەو بوو، ئەوە هەڵوێستی دروست لە بەرامبەریدا، بریتیە لە وەلانەوەی، هەروەها لەوانەیە زانیارییەکە دروست بێت، بەڵام بە بەڵگەگرتنەکەی لە ئاست بەرامبەردا نادروست بێت، ئەوکات پێویست دەکات رەخنەگر وردبینی بکات لە قسەکەدا و پشکنینی بۆ بکات و تەنها لەبەرئەوەی زانیاریەك باسکراوە کە لەبەردەم رەخنەی زانستیدا خۆی پێ ناگیرێت، نەشلەژێت.

نموونەی واقیعی:

**یەکەم:** بەرپەرچدانەوەو تانەدان لە فەرموودەکەی موعاویە (رەزای خوای لێ بێت) بەو بیانووەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لێکردووە، ئەم گێڕانەوەیە نەسەلماوە، بەم چەشنە بانگەشە و ئەنجامەکەش پووچەڵ دەبنەوە.[1]

---

(١) - مسند البزار (٢٨٦/٩) (٣٨٣٩)

**دووەم:** تانەدان لە ئەبووهورەیرە ڕەزای خوای لێ بێت بە بیانووی ئەوەی عومەر تۆمەتباری كردووە بە دزی، ئەم گێڕانەوەش نەسەلماوە.

**سێیەم:** گومانخستنە سەر سوننەت و فەرمووده بەو بیانووەی عومەر پەڕاوێكی سووتاندووه كە فەرموودەی تێدا بووە،[1] زۆرن ئەوانەی ئەم گێڕانەوەیە بە بەڵگە دەهێننەوە، هەواڵەكەش ڕاست نیە.[2]

**چوارەم:** كەمكردنەوەی پێگە و مەكانەتی ئەبووهورەیرە بە بیانووی فەرموودەی (زر غبا تزدد حبا)،[3] لە كاتێكدا ئەم بەسەرهاتە ڕاست نیە.

هەرچوار گومانەكەی پێشوو نموونەی بڕێك بانگەشەن كە پشتیان بەستووە بە گێڕانەوەی نادروست، بەمەش پووچەڵ دەبنەوە.

جۆرێك بانگەشەی تر هەیە كە پشتی بەستووە بە گێڕانەوەی دروست، بەڵام لە كاتی وردبینی لە شێوازی بەڵگەوەرگرتن لەو گێڕانەوانەدا، دەبینین بنیادی بەڵگەوەرگرتنەكە نادروستە،.

نموونــــە:

**یەكەم:** بەڵگەهێنانەوە بە فەرمایشتی خوا (مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ)، (لەم كتێبەدا كەمتەرخەمیمان نەكردووە لە هیچ شتێكدا و هەموویمان باسكردووە) هەتا بۆ نكووڵیكردن لە فەرمووده پشتی پێ ببەستن، دیوی هەڵەی ئەم كارە لەوەدایە كە مەبەستی كتێب لەم ئایەتەدا لەوحولمەحفووزە نەوەك قورئان، بۆیە ئەو زانیاریە دروستە ئەو ئەنجامە ناگەیەنێت كە ئەوان دەیڵێن.

---

(١) - ئەم گێڕانەوە بۆ پێشەوا ئەبووبەكر باس دەكرێت و گوایە عائیشە گێڕاویەتیەوە كە باوكی پێنج سەد فەرموودەی سووتاندووە، زەهەبی لە (تذكرة الحفاظ، ج١، ص ١١) هێناویەتی و دوای گێڕانەوەكەش دەڵێت: ئەم گێڕانەوەیە ڕاست نیە. وەرگێڕ.

(٢) - مصنف عبدالرزاق (٣٢٣/١١) (٢٠٦٥٩).

(٣) - الطبقات الكبرى لابن سعد (١٨٨/٥) (٦١٧٠).

یان فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت (وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ)، (ئەم کتێبە -قورئان- مان بۆ دابەزاندویت بۆ ئەوەی ببێتە روونکەرەوەی هەموو شتێك).

دواتر لە باسی گومانەکان لەسەر سوننەت و فەرمووده، مشتومڕی ئەو بەڵگانە دەکەین کە بۆ نکووڵیکردن لە فەرمووده پشتیان پێ دەبەستن.

**دووەم:** بەبەڵگەهێنانەوەی ئەو فەرموودەی باس لە ڕێگریی نووسینەوەی فەرمووده دەکات، ئەمە دەکەنە بەڵگەی ئەوەی فەرمووده بە بەڵگە ناگیرێت.[1]

زانیارییەکە لای زۆربەی زانایان صەحیحە، بەڵام ناگاتە ئەو ئەنجامەی نکووڵیکارانی فەرمووده دەیانەوێت، چونکە ڕێگریی لە نووسینەوەی فەرمووده، واتای بەبەڵگە نەبوونی نیە، چونکە نکووڵی لە بەبەڵگەبوونی گێڕانەوەیەك، بڕێك ڕێوشوێنی هەیە کە مەرجی نەنووسینەوەی تێدا نیە.

چەند کەلێنی تر هەن کە دەکرێت بە بیرێکی رەخنەگرانە، نەگونجانەکانی ناو ئەو بەڵگەیە ئاشکرا بکات کە بۆ پاڵپشتی گومانێك بەکارهێنراوە.

نموونە:

هەمان ئەو فەرموودەی پێشوو کە باس لەوە دەکات ڕێگریکراوە لە نووسینەوەی هەر شتێك جگە لە قورئان، بەڵام لێرەدا جۆری کەلێنەکە جیاوازە لەو بەندەی پێشوو، چونکە ئەو کەسەی ئەم فەرموودەی بە بەڵگە هێناوەتەوە، بەڵگە بە شتێك دەهێنێتەوە کە خۆی پێی وایە نابێت بە بەڵگە بهێنرێتەوە، ئەمەش دووفاقی و نەگونجانە.

---

(١) - فەرموودەکە موسلیم لە صەحیحەکەیدا (٤٠٠٣) هێناویەتی لە ئەبووسەعیدی خودریەوە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (لَا تَكْتُبُوا عَنِّي ، وَمَنْ كَتَبَ عَنِّي غَيْرَ الْقُرْآنِ فَلْيَمْحُهُ ، وَحَدِّثُوا عَنِّي وَلَا حَرَجَ)، (قسەکانی من مەنووسنەوە، هەرکەسیش جگە لە قورئان شتێکی تری لە منەوە نووسیوەتەوە، با بیسڕێتەوە، بەڵام دەماودەم قسەکانم لێوە بگێڕنەوەو کێشەی نیە)

## بنەمای دووەم: پرسیاری پسپۆڕان:

تێبینی دەکرێت، لەلایەن توێژی ئەو گەنجە کوڕ و کچانەی کاریگەرن بە گومانە ئیلحادی و نائایینیەکانەوە، لەو بابەتانەی لەو بوارەدا دێتەڕێیان، خۆپاراستنێك هەیە بۆ پرسیارکردن لە زانایان و زانستخوازان، پێشتریش وتمان شێوە و تایبەتمەندیەکی شەپۆلی گومانسازیی هاوچەرخ لە کۆمەڵگەی خۆماندا بریتیە لە (شاراوەیی).

لەوانەیە لەو خۆدوورگرتنەیاندا، لای خۆیانەوە بیانوویەکیان بەدەستەوە بێت، گوایە ئەگەر بپرسن، سەرکۆنە دەکرێن و پیایاندا هەڵدەشاخن و پێشوازی و گوێگرتنێکی ڕێزدارانە بەدیناکەن، لەوانەیە ئەم ترسەیان لەبەر هەڵسوکەوتی هەندێ مامۆستا و زانستخوازەوە روویدابێت، بەڵام زێدەڕۆیی کراوە لە وێنەکردنی حاڵەتە گشتیەکە سەبارەت بەم پرسە، چونکە مەیدانەکە چۆڵ نیە لەو کەسانەی کە گوێ و عەقڵ و دڵیان کردۆتەوە بۆ ئەو پرسیارانە و بە هەڵسوکەوتی جوان مامەڵە لەگەڵ بەرامبەردا دەکەن،[1] ئەبێت متمانەی نێوان کوڕ و باوك، مامۆستا و خوێندکار بچێنرێت و زانایان و بانگخوازان و زانستخوازان، دڵ و دەرگایان واڵا بکەن بۆ پێشوازی لە پرسیارەکانی ئەم نەوەیە و متمانە و دڵنیاییان لا دروست بکەن با پرسیارەکە هەر جۆرە پرسیارێك بێت، چونکە دلنیایی کلیلی گەیشتنە، ئەگەر دڵنیایی نەبوو و متمانە نەما، ئەوکات بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان، بەدوای کەسانی پەست و بێ ئاستدا دەگەڕێن.

بیرمان نەچێت، لەم بنەمایەدا باسی ئەو پسپۆڕانە دەکەین کە خاوەنی زانیاری و توانان بۆ وەڵامدانەوەی گومانەکان، نەوەك کەسانێکی سەرپێیی و نووسەرانێك کە لە بواری ئەو زانستانەدا هیچ ئاستێکیان نیە.

خوای گەورە دەفەرموێت (فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)، (دەی پرسیار لە شارەزایان بکەن ئەگەر نازانن).

---

(١) - لە چاکترین پێناوەکانی پەیوەندیی بۆ وەڵامدانەوەی گومانەکان، بریتیە لە ماڵپەری المحاور (http: almohawer.com).

## بنەمای سێیەم: پێداچوونەوەی هەوڵەکانی پێشوو لە وەڵامدانەوەی هەمان ئەو پرسانەی کێشە و گرێیان دروست کردووە:

هەر پرسیار، یان گومان و کێشەیەکی پەیوەست بە ئیسلام و بنەما چەسپاوەکانی تێدەپەڕێت، پێشتر خراوەتەڕوو و چارەسەریشی بۆ کراوە، بەتایبەت لە هەندێ بابەتی شەرعیی وەك قەدەر و بەبەڵگەبوونی فەرموودە، زۆرجار گەنجانێك ئەو جۆرە پرسیارانە دووبارە دەکەنەوە، وەك: چۆن زانینی لەپێشتری خوا و سزادانی بێباوەڕان پێکەوە بگونجێنین؟ ئەمە لە دیارترین پرسیارەکانی بواری بیروباوەڕە، زۆرێك لە زانایان چارەسەری ئەم گرفتەیان کردووە.

یاخود پرسیار دەکەن

حیکمەت چیە لەوەی خراپە هەیە؟

حیکمەت چیە ئیبلیس بەدیهێنرا؟

قسە لەسەر هەندێ فەرموودە دەکەن، وەك فەرموودەی جادووکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ، یان کەسانێك پێیان وایە هەندێ فەرموودەی تایبەت بە باسی مەسیحی دەججال پێکەوە ناگونجێن، ئەم جۆرە پرسیارانە کە لە ناوەندە هزرییە هاوچەرخەکاندا دەوترێنەوە.

ئەوەی گرنگە، ئەوەیە کاتێك مرۆڤ لە بابەتێکی شەرعیدا گومانێکی دێتەڕێ، بگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵانەی پێشوو کە هەوڵیانداوە چارەسەری هەمان ئەو کێشەیە بکەن، زۆرجار وەڵامی پێویست بۆ گرێ و گرفتەکە وەردەگرێت، دەشکرێت پرسیار لە پسپۆڕان بکات سەبارەت بە گرنتگرین ئەو کتێبانەی لەو بارەوە نووسراون.

هەندێ کتێب هەن هەوڵیانداوە تەنها بە بوارێکی دیاریکراوەوە نەوەستن و هەرچی گرێ و گرفتی هەر بوارێکی دیاریکراو هەیە، چارەسەریان بکەن و دیارترین ئەو پرسیارانەی لە چەندین بواردا خراونەتەڕوو، وەڵامیان بدەنەوە، وەك مەوسوعەی بەیانولئیسلام.

**بنەمای چوارەم: موتەشابیهەکان بگێردرێنەوە بۆم موحکەمەکان:**

مەسەلەی موحکەم و موتەشابیهـ لەو بابەتە مەنهەجیە گرنگانەیە کە لە تێگەیشتنی قورئاندا پێویستە، خاڵی جیاکەرەوەشە لەنێوان ئەوانەی دڵیان گەرد دەگرێت و راسخ و پێداکوتاواندا، خوای گەورە دەفەرموێت (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ)، (خوای گەورە ئەو خوایەیە کە ئەم کتێبە پیرۆزەی دابەزاندە سەرت کە هەندێ ئایەتی موحکەمی تێدان کە ئەمانە بنچینەی قورئانن، هەندێك ئایەتی موتەشابیهیشی تێدایە، جا ئەو کەسانەی کە گەرد و لادان لە دڵیاندا هەیە، ئەمانە ئەچن بە دوای ئایەتە موتەشابیهەکاندا بۆ ئەوەی گومان بۆ خەڵك دروست بکەن و بیروبۆچوونی خۆیانی لەسەر بلێن).

ئیبن کەسیر ماناو مەبەستی ئەم ئایەتە لە قسەیەکی روون و گرانبەهادا پوخت دەکاتەوەو دەڵێت: (خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە لە قورئاندا هەندێ ئایەت هەن موحکەمن و ئەوانە ئوممولکیتابن، واتە روونن و بەڵگەیان دیارە و بە هیچ چەشنێك لە هیچ کەس پەنهان نین، برێك ئایەتی تریش هەن کە واتا و مەبەستیان لای هەندێ، یان زۆربەی خەڵك روون و دیار نیە، جا هەرکەس ئەو نارِوونیانە بگێرێتەوە لای روونەکان و موحکەمەکان پێش موتەشابیهەکان بخات، ئەوە رێنموونی وەرگرتووە، هەرکەس بە پێچەوانەوە بێت، ئەنجامی پێچەوانەی دێتەرِێ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت ئەوانە ئوممولکیتابن، واتە ئەو بنەرِەتەن کە لەکاتی نارِوونیدا بگەرِێیتەوە بۆیان، ئەوانەش کە موتەشابیهن، واتە واتاو مەبەستیان وا نیشان نادات وەك موحکەمەکان بن، دەکرێت لەرووی دەق و پێکهاتەوە شتێکی تر بن، نەوەك لەرووی مانا و مەبەستەوە).[1]

ئەمە ئەمانگەیەنێتە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ، ئەویش ئەوەیە کە پێویست دەکات سەرجەم دەقەکانی بابەتێك بخەینەرِوو و تەنها بە لێوەرگرتن و جیاکردنەوەی بەشێکەوە نەوەستین، لەوانەیە دەقەکە موتەشابیهـ بێت و بەبێ دەقێکی موحکەم کە لە رێی دەقی ترەوە دەیزانین، واتاکەی روون نەبێتەوە.

---

(١) - تفسير القرآن العظيم (٢/٢٥٣).

ASTANA

جا کاتێك مەسیحیەك دێت و دەڵێت: قورئانەکەی ئێوە بەڵگەی فرەخودایی تێدایە، بەڵگەکەش ئەم ئایەتەیە (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)، (ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووەو خۆیشمان دەیپارێزین)، بەڵگەکەش ئەوەیە کە لە ئایەتەکەدا بڕێك دەستەواژە هەن واتای کۆ دەبەخشن، وەك (إنا) (نحن) (نا) (واوی کۆکەرەوە)، ئێمەش پێی دەڵێین: ئەو ڕاناوانە وەك چۆن واتای کۆ دەبەخشن، هاوکات واتای گەورەییش دەبەخشن، پادشاکان کاتێك باسی خۆیان دەکەن، بۆ نیشاندانی گەورەیی خۆیان، بە دەربڕینی کۆ قسە دەکەن، ئەگەر بڕوانینە دەقی ڕوونی موحکەم لە قورئاندا، بریتیە لە یەکخواپەرستی، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)، (انْتَهُوا خَيْرًا لَكُمْ إِنَّمَا اللَّهُ إِلَهٌ وَاحِدٌ سُبْحَانَهُ)، (ئەی موحەممەدﷺ بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کە من دەیپەرستم، تاك و تەنیایەو، هاوەڵ و هاوبەشی نیە)، (واز لە بیروباوەڕی سیانەخوایی بهێنن، ئەوە باشترە بۆتان، چونکە تەنها الله تاکە زاتی پەرستراوە، گەورەیی و ستایش بۆ خوای گەورە)، بەمەش ئەو گومان وروژاندنەی پووچەڵ دەبێتەوە.

### بنەمای پێنجەم: خۆگرتن لەبەردەم ئەو گومانانەی کە وەڵامەکەیان نازانرێت:

هەندێ جار هەندێ کەسم تووش دەبێت کە گومان لەدڵیاندایە، کاتێك پرسیار دەکەم هۆکارەکە چیە، باسی شتێك دەکەن کە پێویست ناکات گومانی لێ بکەوێتەوە، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە کە ئەوان وەڵامی ئەو گومانەیان پێ نەبووە کە بۆیان خراوەتەڕوو، ئایا ئیمانی موسڵمان هێندە لاوازە بە کەمترین کزەبا بلەرزێت؟ ئایا ئەگەر وەڵامت پێ نەبوو، پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ گومانت بۆ دوروست ببێت، ئیتر هەڵوێستێکی تر نیە کە ناوی (گەڕان، پرسیارکردن، ڕەخنەگرتن لە زانیاریەکە) بێت؟

نەزانین واتای نەبوون نیە، واتە ئەگەر وەڵامێکمان نەزانی، واتای ئەوە نیە وەڵام نیە، کاتێك وردبینی دەکەین لە هەندێ گرێ و گرفتی وادا کە گومان دەنێنەوە، دەبینین قسەکردن تیایدا کاتی لێکۆڵینەوەیەکی بردووە، جا ئەگەر ئەو کەسەی پرسیارەکەی لا دروست بووە، لە ماڵپەرە جێمتمانەکانی ناو ئینتەرنێتدا گەڕانێك خێرای بکردایە، بە دڵنیاییەوە دەیان وەڵامی ئامادەی دەهاتە بەردەست.

## بنەمای شەشەم: لێکۆڵینەوەی نەرێنیەکانی وەرگرتنی ئەو بیرانەی پێچەوانەی قورئان و سوننەتن:

ئەگەر ئەو کەسەی بڕێك گرێ و گرفت و پرسیاری لەژێر سێبەری ئیماندا لا دروست بووە، وابزانێت لە تونێلی ئیلحاددا ئەو گرێ و گرفتانە چارەسەر دەبن، ئەوە زۆر هەڵەیە، چونکە ئەگەر لە کاتی ئیمانەکەیدا دە پرسیاری لا دروست ببێت، ئەوە ئەوکاتەی واز لە دین دەهێنێت، پرسیارەکان دەبنە هەزار، جیاوازی نێوان ئەم پرسیارانە و ئەوانی دی ئەوەیە کە وەڵامەکان لە سایەی ئیماندا بەهێزن، بەپێچەوانەی وەڵامەکانی ئەولا کە لەوانەشە هەر وەڵامیان نەبێت.

نموونە: پرسیارکردن سەبارەت بە بوونی خراپە، یان وەك هەندێ پێیان خۆشە ناوی بنێن: گرێی خراپە، لەراستیدا گرێیە، بەڵام بۆ مولحید نەوەك بۆ باوەڕدار، چونکە بڕوابوون بە رۆژی دوایی و قەزا و لێپێچینەوەو پاداشت و سزا، وامان لێ دەکات بڕوامان وابێت هەرکەس بە ستەم بکوژرێت، یان بسووتێنرێت، یان دەستدرێژی بکرێتەسەر، ئەوە لە رۆژی دواییدا مافی خۆی وەردەگرێتەوە، ستەمکاریش سزای خۆی وەردەگرێت، بەڵام ئەو کەسەی بڕوای بە رۆژی دوایی نیە، وەڵامی چیە؟ ئەگەر لێی بپرسین: سەرەنجامی ستەمکاران بە درێژایی مێژوو چیە؟ ئایا مافی ئەوانەی ژێر گڵ خران، کە لەلایەن ئەو ستەمکارانەوە ستەمیان لێکرا؟

نموونەی پرسیارێکی تر: کێ بوونی (کەونی) بەدیهێناوە و بۆچی؟ ئەگەر کەسێك بڕوای نەبێت بە بوونی بەدیهێنەرێك، دەستەوسان و بێ وەڵام رادەوەستێت، بۆیە دەبینیت کەسی مولحید دەستی گرتووە بە پەستترین بیردۆزەی ئەو بوارەوە هەتا وەڵامێکی پێ بداتەوە.

چەند پرسیارت دەوێت ریزیان بکە: بۆچی کەون بە رێکخراو دێتەپێشچاو؟ بۆچی بە بڕێك یاسا و رێسای ورد کەون بەڕێوەدەچێت؟

چۆن صودفە زانیاریە وردە بۆماوەییەکان لەناو قاپێکی تەواو بچووکی (تۆو) دا بەرهەم دەهێنێت؟ چۆن ئەو زانیاریانە کارلێکیان کرد و لەو کەسەدا کە هەڵگریەتی، سیفەتی راستەقینەیان وەرگرت؟

هەروەها ئەو كەسەش كە دەستبەرداری فەرموودە دەبێت لەبەرئەوەی بڕێك پرسیاری بۆ دروست بووە و دەڵێت تەنها دەقی قورئانم بەسە، یەكەم شت كە بەرنگاری دەبێتەوە، خودی دەقی قورئانە كە فەرمان دەكات بە گوێڕایەڵیی و شوێنكەوتنی پێغەمبەر و هەڕەشە دەكات لەو كەسەی پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری خوا بجووڵێتەوە، ئەوكات ئەو نكووڵیكارە دەكەوێتە نێو بڕێك گرێ و گرفتی راستەقینەوە بەرامبەر بەو دەقانە، هەروەك ڕێی دەكەوێتە چەندین حوكم كە هەموو موسڵمانان كۆدەنگن لەسەر كارپێكردنی و لە قورئانیشدا نین، ئەمەش چەندین پرسیاری تریشی لێ بەرهەم دێت، لە راستیدا ئەم كەسە دەرباز نەبووە لە گرێ و گرفت و پرسیارەكان، بەڵكو لە كۆمەڵێك گرفت و پرسیاری بچووكەوە چووە بۆ بڕێك گرێ و پرسیاری راستەقینەی گەورە.

## بنەمای حەوتەم: مامەڵەنەكردن لەگەڵ رارایدا بە هەمان چەشنی مامەڵە لەگەڵ گومان:

شتێكی ئاساییە ئیماندار بە قۆناغی ختوورە و رارایی‌دا تێپەڕێت و خاوێنیی ئیمانەكەی ئازار بدات، بڕێك بابەتی بێزاركەر لە دڵدا بەرامبەر بە مافی خوای گەورە، یان قەزا و قەدەری خوا، یان هەر بابەتێكی تری شەرع دروست بكات، ئەمانە بەڵگەی لاوازیی ئیمان و دووروویی نین، تەنانەت هاوەڵان و زانایان و پەرستشكارانیش لێی پارێزراو نەبون، بەڵام پەنایان بە خوا گرتووە لەو شتانە و لە خودی شەیتانی نەفرەت لێكراو و هەوڵیانداوە بیركردنەوەی خۆیانی لێ دووربخەنەوە.

ئەگەر ئیماندار لەم چوارچێوەدا مامەڵەی لەگەڵ بكات، ئەمە كێشە نیە، بەڵكو بە ویستی خوا بە چاكە بۆی دەنووسرێت، بەڵام كێشە راستەقینەكە ئەوەیە كە هەندێ كەس نازانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بكەن و دەچن بە دەم هەر ختورەیەكی بێزاركەرەوە كە دێتە رێیان هەتا دەیانگەیەنێتە باری خەم و خەفەت و بێهیواییەك كە ناتوانێت بەهۆیەوە چێژ لە هیچی تر وەربگرێت، لەوەش خراپتر ئەوەیە كە مرۆڤ تووشی پەرچەكردار بكات و لەدەست پاك و خاوێنی و نوێژ بێزار بێت و لەدەستیان رابكات، یان بێزار بێت لە تەواوی دین.

بواری وەسوەسە جیاوازە لەو بوارە راستەقینەی گومانەکان کە بە وەڵامدانەوە چارەسەر دەکرێت و هەرکات وەڵامێکی روون و بەهێزی بۆ پەیدا بوو، ئیتر گومانەکە دەڕەوێتەوەو کۆتایی پێ دێت، بەڵام وەسوەسە چارەسەرەکەی وەڵامدانەوە نیە، چونکە بەوە کۆتایی نایەت، با تەنانەت سەد جاریش وەڵام بدرێتەوە، بەڵکو چارەسەرەکەی پشتگوێ خستنیەتی.

نیشانەیەکی گومان ئەوەیە کە -زۆربەی جار- سەرچاوەیەکی دیاریکراوی هەیە، یان گرتەیەکی بینراو، یان کتێبێك، یاخود هاوڕێیەك، یان شتێکی لەو چەشنانەیە، بەڵام وەسوەسە ختوورەیەکە کە مرۆڤ لە ناخی خۆیەوە هەستی پێ دەکات و زۆرجاریش لە کاتی پەرستشدا یەخەی دەگرێت.

پاش ئەم بنەمایانەی باسمان کردن، لەوانەیە هەندێ جار گومانێك لای مرۆڤ بمێنێتەوە کە سەخت بێت لەدەستی دەربازی بێت، یان گومانێك گەورەتر بێت لەوەی ئەم توانای هەبێت وەڵامی بداتەوە، چارەسەری ئەمانە بە نزا و پاڕانەوەو خۆخستنە بەردەستی خوایە هەتا گومانەکە بڕەوێتەوەو سینە فراوان بێت و خەم و خەفەتیش ئۆغر بکات.

# چەند بنەمایەکی گفتگۆ و مشتومڕ لەگەڵ گومانسازان

**بنەمای یەکەم: پێش گفتگۆ: تێگەیشتن لە مەزهەبی بەرامبەر و تەماشاکردنی کەرەستە بینراو و خوێندراوە بەردەستەکانی:**

هۆکارێکی گرنگی سەرکەوتن لەکاتی مشتومڕ لەگەڵ گومانسازاندا، بریتیە لە شارەزایی پێشوەختە سەبارەت بە قسەو راستیی مەزهەب و بنەڕەت و گرنگترین بەڵگەکانیان، ئەمە یارمەتیدەرە بۆ ئامادەکردنی وەڵام و لە کتوپڕێکدا قسەیەکی ئەوانت نەیەتەڕێ کە سەخت بێت بەبێ خۆئامادەکردن وەڵامی بدەیتەوە، ئەگەر ئەمە رووبدات، لەوانەیە هەڵوێستی خاوەن مافەکە لاواز بکات.

هەرکەس چووبێتە ناو گفتگۆ و مشتومڕی گومانسازانەوە، چاك لە بەها و گرنگیی ئەم بنەمایە تێدەگات.

**بنەمای دووەم: رێککەوتن لەسەر بنەمایەکی هاوبەش لەکاتی گفتگۆدا:**

لەوانەیە هەریەك لەو دوو لایەنە، بە بەڵگەیەکی دروست دژ بە بەرامبەرەکەی بەڵگە بهێنێتەوە، ئەوی دیکەش لەبەرئەوەی دان نانێت بەو بەڵگەدا، دان نەنێت بە قسەکەشیدا، بەمەش ناکۆکی دروست دەبێت و کات بە فیڕۆ دەچێت، لەکاتێکدا ئەگەر لە سەرەتاوە رێککەوتنێك هەبێت لەسەر سەرچاوەکانی ئەو بەڵگانەی لە مشتومڕەکەدا باس دەکرێن، زۆر باشتر و رێیەکی کورتتر وەدەست دەکەوێت، پێویستە ئەوەش بزانین ئەم رێککەوتنە بۆ هەموو مشتومڕێك پێویست نیە، لەوانەیە هەندێ کاتیش بەردەست نەکەوێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بە سوودە و کات و توانا دەگەڕێنێتەوە.

نموونە: لەوانەیە بۆ وەڵامدانەوەی مولحیدێك پێویستیت بە بەڵگە عەقڵیە سەرەتاییەکان بێت لەسەر بوونی خوا وەك بەڵگەیەکی هۆکاری، کەچی ئەو خێرا پێت بڵێت تەنها بڕوای بە هەستپێکراوەکان هەیە و نکووڵی لە بەڵگەکانی عەقڵ دەکات.

## بنەمای سێیەم: دەستنیشانکردنی بازنەی ململانێ:

لە هەندێ مشتومڕدا، لایەنێك پاش کەمێك لە دەستپێکردنی مشتومڕەکە ئینجا دەزانێت کە ئەو دوانە کۆکن و ناکۆکییان نیە، بەڵکو هەرکامیان بە هەڵە لەوی تریان تێگەیشتووە، ئەمە لە زۆر گفتگۆی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕوودەدات کە زۆرجار کەشێکی خۆبارگاویکردنەوەی دەروونی و خێرایی و ڕارایی پێکدەهێنێت، چاکتر وایە هەریەك لەو دوو لایەنەی گفتوگۆکە، چاك لە یەکدیی تێبگەن و بازنەی ململانێکەیان دیاریی بکەن، ئینجا هەنگاو بنێن بۆ ئامانجێکی ڕوون.

جێی داخە هەندێ کەسی شەرعیی ئەگەر بیانەوێت باسی گومانێکی دیاریکراو، یان گرێ و پرسیارێکی هزریی بکەن، نەتوانن قسەیەکیان پێ بێت بۆ شوێن و بازنەی ململانێکە، یان خاڵی گرفت لای کەسی بەرامبەر، ئیتر نەتوانێت وەڵامێکی بداتەوە کە گومانەکە بڕەوێنێتەوە، ئەمەش لە لاوازی لەبەرچاوگرتن و تەسکبینیەوەیە، بەڵکو پێویستە شوێن و بازنەی ململانێکە و خاڵی کێشەکە بزانرێت هەتا چارەسەرەکە بەسوود و ڕاستەوخۆ بێت.

## بنەمای چوارەم: وردبینی لە قسەی بەرامبەر و ڕەخنەلێگرتنی و وریابوون لەو کێشە و گرفتانەی لە قسەکانیدا هەیە:

ئەو کەسەی لە بنەڕەتێکی مەنهەجیی ڕوون و پتەووە هەنگاو هەڵنەنێت، دەکەوێتە ناو گرێ و گرفت و دووفاقییەوە، ئەگەر وتەکانی بۆ خۆی و تەماشاکار و گوێگران بخرێنەڕوو، هەڵەکانی دەردەکەون و هەڵوێستی لاواز دەردەکەوێت، بۆیە وردبینی لە قسەی کەسی گفتوگۆکەر و هەوڵدان بۆ زانینی سەرچاوەی قسەکانی و شێوازی بەڵگەهێنانەوەی، یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی ئەو قسانەی بەرامبەر لە وتەکانیدا دەربکەیت کە پێچەوانەی ڕا و بنەماکانی خۆیەتی و دووفاقییەکانی و خراپی بەڵگەهێنانەوەکانی ئاشکرا بکەیت.

## بنەمای پێنجەم: نەوەستان لە سنووری بەرگریدا:

هەڵوێستی بەرگریی، هۆی لاوازکردنی هەڵوێستی هێرشبردنە، بەتایبەت ئەگەر وەڵامدانەوەکانی ئەو کەسەی کە بەرگری دەکات لە حەق، لەوپەڕی بەهێزیدا نەبن، هەروەك گومانسازان بە جیاوازی ئاراستەکانیانەوە، مەزهەبەکانیان بەدوور نین لە هەڵە و پەڵەی گەورە و پێویستە ئەوانە لەبەرچاوی خەڵکدا زەق بکرێنەوە، ئەمەش لە ڕێی ورووژاندنی پرسیار لەسەر ئەو هەڵە و پەڵانە و داوایان لێبکرێت وەڵامیان بدەنەوە.

مولحید و نائایینیەکان، ڕێیەکیان گرتۆتەبەر کە بریتیە لە ورووژاندنی گومانەکان بەرامبەر بە ئیسلام بێ ئەوەی ڕەخنە بگیرێت لە پایە و بنەڕەتەکانی بیرو بڕوا و بنەماکانی تێڕوانینی خۆیان، ئینجا لەبەردەم جەماوەردا خۆیان بە بەهێز نیشان دەدەن و کەسی خاوەن حەقیش بە جۆرێك لە لاوازی دەردەکەوێت، مەگەر کەسێك خوای گەورە هێزی بەڵگەهێنانەوەو شێوازی وەڵامدانەوەی بەهێزی پێ بەخشیبێت وەك ئەوەی ئەحمەد دیدات ڕەحمەتی خوای لێ بێت، ئەمەیان شتێکی ترە.

## بنەمای شەشەم: خۆبەدەستەوەنەدان لە ئاست هەندێ پێشەکیی پووچدا:

خۆبەدەستەوەدانمان لە ئاست هەندێ پێشەکیی پووچدا، واتە بەرامبەر پابەندمان دەکات بە هەندێ ئەنجامی پووچەڵەوە کە لەوانەیە ئێمە ئەوەمان نەوێت، بۆیە پێویستە لە سەرەتاوە خۆمان نەدەین بەدەستەوە، ئەمەش ڕێ لە گومانساز دەگرێت.

نموونە: هەندێ مولحید هەنگاو بە هەنگاو مشتومڕت لەگەڵ دەکات، سەرەتا دەڵێت: هەموو هەبوویەك، بەدیهێنەرێکی هەیە، مەگەر وانیە؟ ئەگەر بڵێیت بەڵێ، دەڵێت: دەی خوایش هەیە، ئەی کێ خوای هێناوەتە بوون؟ هەڵوێستی دروست لەوەدا ئەوەیە کە لە سەرەتاوە خۆت تەسلیمی ئەو بنەمایە نەکەیت، چونکە بنەمایەکی نادروستە، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەموو بەدیهاتوویەك بەدیهێنراوێکی هەیە، خواش بەدیهاتوو نیە، ئیتر پرسیاری ئەوەی لەبارەوە ناکرێت کێ بەدیهێناوە یان دروستی کردووە یان هێناویەتیە بوون.

**بنەمای حەوتەم: ئەگەر بانگەشە دەكەیت، بەڵگە، ئەگەریش قسە دەگوازیتەوە، راستیی قسەگواستنەوەكە:**

عەزەدەدینی ئیجی لە (آداب البحث) دا دەڵێت: ئەگەر قسەیەكت كرد كە هەواڵدانی تێدابوو، ئەگەر قسەكەت دەگواستەوە، راستیی قسەگواستنەوەكەت بسەلمێنە، ئەگەریش بانگەشە دەكەیت، بەڵگە بخەرەڕوو).[١]

ئەم بنەمایە پوختەیەكی گرنگی زانستی جەدەل نیشان دەدات، واتاكەشی ئەوەیە: هەركەس بانگەشەیەك دەكات، لێی وەرناگیرێت هەتا بەڵگەی لەسەر نەهێنێتەوە، هەركەسیش زانیاریەك لە زانا یان بیریار، یان دەستە، یاخود سەرچاوەیەكەوە بگوازێتەوە، پێویستە دروستی وەرگرتنی زانیاریەكە لە سەرچاوەكە بسەلمێنێت، ئەگەر ئەمە نەكات، قسەكەی هیچ بەهایەكی نیە.

ئەگەر ئەم بنەمایە بە چاكی جێبەجێ بكرێت، بەرگریەكی بەهێز دەبەخشێت بە گەنجان لە ئاست گومانە هاوچەرخەكاندا.

لە جیاكردنەوەی (دروستی گواستنەوە) و (دانەوەپاڵ) دا تێبینیەك هەیە، بۆ نموونە: هەندێ كەس بۆ تانەدان لە هاوەڵان پشت بە هەندێ رووداوی مێژوویی دەبەستێت، ئەگەر پێی بڵێیت: ئادەی بیسەلمێنە، دەڵێت: ئەوە لە مێژووی تەبەریدا، لە فلانە بەش و فیسارە لاپەڕەدا هەیە.

لە راستیدا ئەمە نیشاندانی دروستیی گواستنەوەكە نیە، بەڵكو تەنها دانەوەپاڵە، ئێمە پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە سەر مێژووی تەبەری بۆ ئەوەی دڵنیا ببینەوە لە سەنەدی ئەو چیرۆكە، ئایا سەنەدەكەی صەحیحە یان نا؟ خود لەبنەڕەتەوە سەنەدی هەیە یان نا! چونكە تەبەری صەحیحبوونی لە كتێبەكەیدا بە مەرج نەگرتووە، بۆیە ئەگەر شتێك بدرێتەوە پاڵ تەبەری، ئەمە سەلماندنی دروستیی قسەكە نیە، بەڵكو تەنها ئاڕاستەت دەكات بۆ سەرچاوەیەك كە پێویستە توێژینەوەی لەسەر بكرێت.

---

(١) - حاشیة الصبان علی شرح آداب العضد، ص ٦.

## بنەمای هەشتەم: بەئاگابوون لە بەڵگەهێنانەوەی هەڵێنجراو بە دەقە شەرعییەکان و پێویستی خستنەڕووی سەرجەم دەقەکانی بابەتەکە:

ئەمە لە گرنگترین بنەماکانە، چونكە زۆربەی گومانساز و مولحید و موژدەبەران پەیڕەوی ئەمە دەكەن، وەك ئەوەی هەندێكیان ئەم ئایەتە دەكەنە بەڵگە بۆ راستیی ئایینی مەسیحیەت و واز لەو ئایەتانەی دی دەهێنن كە كوفری مەسیحیەكان روون دەكاتەوە (قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا)، (پێیان بڵێ، بڕۆ دەقی تەورات بهێنن و بیخوێننەوە)

نموونەیەكی تر: بەڵگە هێنانەوە بە فەرمایشتی خوا (إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ) (تۆ ناتوانیت رێنموونی هەركەس بكەیت كە خۆشت دەوێت)، دەكەنە بەڵگەی ئەوەی مرۆڤ ملكەچە و بەڕێ دەكرێت و خۆی سەرپشك نیە، واز لەو ئایەتانەی تر دەهێنن كە ویست و ڕێدان بە مرۆڤ لەخۆدەگرێت، وەك فەرمایشتی خوا (فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)، (هەركەس دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت، هەركەسیش دەیەوێت با بێباوەڕ بێت).

نموونەیەكی دی: ئەوانەی نكوڵیی لە سوننەت دەكەن، ئایەتێك دەكەن بە بەڵگە و واز لەو ئایەتانەی دی دەهێنن كە تیایدا فەرمان دەكەن بە گوێڕایەڵیی پێغەمبەری خوا (وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ)، (ئەم كتێبە -قورئان- مان بۆ دابەزاندویت بۆ ئەوەی ببێتە ڕوونكەرەوەی هەموو شتێك).

# چەند تیشکێکی پێویست بۆ ئەو کەسەی بەرگریی دەکات لە ئیسلام و بنەڕەتە چەسپاوەکانی

**یەکەم:** فەزڵ و گەورەیی وەڵامدانەوەی گومانەکان:

**أ:** خوای گەورە دەفەرموێت (وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا)، واتە بە قورئان جیهادیان بکە، ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەو کەسەی وەڵامی بیدعەکاران دەداتەوە، موجاهیدە، تەنانەت یەحیای کوڕی یەحیا دەڵێت: ڕۆچوون و قاڵبوونەوە لە سوننەتدا، زۆر باشترە لە جیهاد).

**ب:** پیشەی پێغەمبەران ڕوونکردنەوەی حەق و ڕەواندنەوەی تیڕوانینە پووچەکانە.

**ت:** خوای گەورە خۆی وەڵامی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە تانە دەدەن لە زاتی خۆی و دین و شەرع و پێغەمبەرەکەی، وەك دەفەرموێت (وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا)،[1] (بێباوەڕان دەیانوت خوای گەورە کوڕی بۆ خۆی بڕیار داوە، بەڕاستی قسەیەکی ئێجگار قورس و ناڕێکتان کرد)، هەتا کۆتایی ئایەتەکان.

هەروەها دەفەرموێت (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا، وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا)،[2] (ئەوانەی باوەڕیان نەهێنابوو دەیانوت: بۆچی قورئان هەرهەمووی بە یەکجار دانەبەزی بۆ سەر پێغەمبەری خوا، بەم شێوازە قۆناغ قۆناغ بۆت دادەبەزێنین بۆ ئەوەی دڵت جێگیر و دامەزراو بکەین پێی، وە بە تەرتیل و جوانیش بۆمان خوێندویتیەوە، ئەو کافرو موشریکانە هەر مەسەل و نەزیلەیەکت بۆ دێننەوە، بۆ وەستانی کارەکەت و ناشرین کردنی ئەم قورئانە، ئێمەش بەردەوام بە وەڵامی هەق و بەجێ و جوانترین تەفسیرێکەوە هاتوین بەهاناتەوە).

---

(١) - مريم: ٨٨-٨٩.

(٢) - الفرقان: ٣٢-٣٣.

ASTANA

**دووەم:** گرنگە تاکی بەرگریکار ئەوەی لا روون بێت کە بەرگریی لە ئیسلام دەکات نەوەك لە بیروبۆچوونەکانی خۆی، ئەمەش وادەخوازێت ئیسلام بەو چەشنە بخاتەڕوو کە هەیە، هاوکات هونەری بانگەواز و پێشخستنی لەپێشینەکان رەچاو بکات.

**سێیەم:** بانگخواز ئەگەر بانگەوازەکەی بە باشترین شێوە گەیاند، ئیتر بەرپرس نیە لە بەدەمەوەهاتنی خەڵك و پێویست ناکات خۆی شپرز بکات بۆ ئەو خەڵکە، بەڵکو هەوڵی خۆی بەخەرج بدات و ئەوەش بزانێت خەڵکێك هەیە حەقی ناوێت، وەك چۆن خوای گەورە چەندین جار ئەوەی لە قورئاندا باسکردووە.

**چوارەم:** پێویستە بانگخواز لە رووی رەوشتی باڵا و ئاکاری ئیسلامییەوە گرنگیی بە خۆی بدات و ببێتە پێشەنگێکی باش، ئەمەش دەبێتە هۆکارێکی کەمکردنەوەی شوێنەواری گومانەکان، چونکە نموونەی رەوشتیی باڵا لە تاکی ئاییندارا، بە بانگەوازێکی بێدەنگی کاریگەر دادەنرێت ﴿وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ﴾،[1] (خۆ ئەگەر کەسێکی تووڕەو قسەڕەق ودڵ ڕەقبای، دەوروبەریان چۆڵ دەکردیی و، لێت دووردەکەوتنەوە).

دیدگایەکی گشتگیر بۆ نەخشەی ئەو گومانانەی لە ئێستادا دژ بە ئیسلام و بنەڕەتە چەسپاوەکانی دەورووژێنرێن[2].

ئەو گومانە سەردەمیانەی لەلایەن مولحیدان و نائایینیەکان و نکوولیکارانی سوننەت و گومانسازانەوە دژ بە ئیسلام و بنەڕەتە چەسپاوەکانی دەورووژێنرێن، دەگەڕێنەوە سەر دوو جۆر، هەرکام لەوانەش چەند بەشێکیان هەیە.

---

(١) - آل عمران: ١٥٩.

(٢) - ئەم دیدگایە هەموو ئەو گومانانە ناگرێتەوە کە دەستاودەست دەکرێن، بەڵکو زۆربەی ئەوانە دەگرێتەوە کە زۆر بڵاون، هەروەك ئەو دابەشکارییەی دەیبینن، ئیجتیهادێکە کە دەکرێت هەڵەی تێدابێت و راست بکرێتەوە، لەم کتێبەدا (زۆربەی) ئەو گومانانەم وەڵام داوەتەوە کە لە نەخشە گشتگیرەکەی ئێرەدا باسکراون.

**جۆری یەکەم:** کۆمەڵێك گومان کە مەبەست پێیان لێدانە لە بنەڕەتی ئیسلام، ئەمانەش چوار بەشن:

**بەشی یەکەم:** گومانەکان سەبارەت بە بوونی خوا و کەماڵ و حیکمەت و کردارەکانی زاتی الله.

ئەمەش دوو لقی لێ دەبێتەوە: **لقی یەکەم:** گومانەکان سەبارەت بە سەلماندنی بوونی خوا، دیارترین ئەو گومانانەی ئەم لقەش بریتین لە:

١- پرسیار: کێ خوای بەدیهێناوە؟

٢- ڕەخنەگرتن لە بەڵگەکانی بوونی خوا، وەك تانەدان لە بنەمای هۆکارێتی.

٣- بانگەشەی بێمنەتبوون لە پێویستی بوونی خوا بەهۆی یاسا کەونیەکانەوە.

٤- بەڵگەهێنانەوە بە هەندێ بیردۆزە و ئەگەری زانستیی نوێ، وەك بیردۆزەی پەرەسەندن و فرە گەردوونی هەندێ بەشی فیزیائی کە قسە لەسەر نەبوونی خوا دەکەن.

**لقی دووەم:** گومانەکان سەبارەت بە کەماڵی خوا و حیکمەتی پەروەردەگار لە کردارەکانیدا، لەدیارترین ئەو گومانانەش کە لەم لقەدا هەن بریتین لە:

١- بۆچی بەدیهێنراوین و فەرمانمان پێکراوە پەرستش بکەین؟

٢- گومانی بوونی خراپە لە جیهاندا.

٣- گومانی وەڵامدانەوەی نزاکان لەلایەن پەروەردگارەوە.

٤- سزادانی بێباوەڕان بە دۆزەخ و بەهەتایی مانەوەیان تیایدا.

٥- کۆکردنەوەی دادپەروەریی خوایی و قەزا و قەدەری خوا و نووسینەوەی کردەوەکانی بەندەکان.

**بەشی دووەم:** گومانەکان سەبارەت بە قورئانی پیرۆز کە دەبێت بە دوو لقەوە:

**لقی یەکەم:** گومانخستنە سەر دروستی دانەوەپاڵی بۆ لای خوا.

**لقی دووەم:** بانگەشەی بوونی هەڵە تیایدا، ئەو هەڵانەش کە بانگەشەیان بۆ دەکرێت سێ جۆرن (زەمانەوانی و زانستیی و دووفاقی نێوان ئایەتەکان).

**بەشی سێیەم:** گومانەکان سەبارەت بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ کە دوو لقی لێ دەبێتەوە:

**لقی یەکەم:** گومانخستنە سەر پێغەمبەرایەتیەکەی.

**لقی دووەم:** تانەدان لە هەڵوێستەکانی لە ماوەی ژیانیدا، لە دیارترین ئەو تانانەش کە لێی دەدرێن بریتین لە هاوسەرگیریی لەگەڵ عائیشە و صەفییە، مەسەلەی فرەژنیی، رووداوی بەنی قورەیزە، رووداوی عورەینیەکان.

**بەشی چوارەم:** گومانەکان سەبارەت بە تەشریعی ئیسلامی، لە دیارترین ئەو گومانانەش لەم بازنەدا بریتین لە:

١- حوکمەکانی تایبەت بە ئافرەت لە ئیسلامدا (بانگەشەی ئەوە دەکەن ستەمی لێکراوە).

٢- حوکمەکانی جیهادی ئیسلامی (بانگەشەی ئەوە دەکەن ئایینی توندوتیژییە).

٣- کۆیلە و سزای هەڵگەڕاوە (بانگەشەی ئەوە دەکەن ئایینێکە پێچەوانەی ئازادیە).

٤- رەجمکردنی زیناکار و دەستبڕینی دز (بانگەشەی ئەوە دەکەن ئایینێکی وەحشیگەرییە).

مەبەست ئەوە نیە کە هەندێ موسڵمان نکووڵی لە شتێك لەوانەی پێشوو بکەن، بەڵکو مەبەست ئەوانەن کە دەیانەوێت بەم هۆیەوە لە بنەڕەتی ئیسلام بدەن.

**جۆری دووەم:** ئەو گومانانەی مەبەست پێیان لێدانە لە بنەڕەتە چەسپاوەکانی شەریعەت، دوور لە بنەڕەتی ئیسلام، ئەمەش پێنج بەش لەخۆدەگرێت:

**بەشی یەکەم:** گومانەکان لەسەر فەرمووده کە چەند لقێکی لێ دەبێتەوە:

**لقی یەکەم:** بنەڕەتی بەبەڵگەبوونی فەرموودەو بێمنەت بوون لێی بەهۆی قورئانەوە.

**لقی دووەم:** بەبەڵگەبوونی گێڕانەوە ئاحادەکان بەتایبەت.

**لقی سێیەم:** گومانەکان لەسەر ئەوانەی فەرموودەکانیان گواستوونەتەوە.

**لقی چوارەم:** لەسەر مێژووی فەرموودە و نووسینەوەو تۆمارکردنی.

**لقی پێنجەم:** لەسەر زانستی فەرموودەو مەنهەجی فەرموودەناسان.

**لقی شەشەم:** لەسەر خودی فەرموودەکان بە بانگەشەی ئەوە لەگەڵ عەقڵ یان هەست، یاخود قورئان، یان زانستی فەرموودە، یاخود بڕێك فەرموودەی تردا ناگونجێن.

**بەشی دووەم:** گومانەکان سەبارەت بە مەنهەجیەتی تێگەیشتن لە دەقی شەرعیی.

**بەشی سێیەم:** گومانەکان لەسەر هاوەڵان.

**بەشی چوارەم:** گومانەکان لەسەر ئیجماع.

**بەشی پێنجەم:** گومانەکان لەسەر حەددە شەرعییەکان.

## شەن و کەوی دیارترین ئەو گومانە سەردەمیانەی مولحید و نائاینیەکان و نکوولیکارانی سوننەت دەیانوروژێنن

لەسەر هەمان ئەو ریزبەندییەی پێشووی ناو نەخشە گشتگیریەکە، باسی گومانەکان و هەڵوەشاندنەوەیان دەکەم، تێبینی ئەوەش بکەن کە پەیامی ئەم کتێبە کورتییە نەوەك درێژەپێدان و فراوان باسکردنی هەڵوەشاندنەوەی گومانەکان، هەرکەسیش دەیەوێت بە دووروودرێژی لەسەری بخوێنێتەوەو شارەزا بێت، ئەوە با بچێتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی کە لە باسی وەڵامدانەوەی هەر گومانێکدا ئاماژەی پێ دەدەم، هەرچەندە هەندێ لەو وەڵامانەی لەسەر گومانەکان دەیخەمەڕوو، بەسە.

پێشتر وتمان کە گومانەکانی سەردەم دوو جۆرن:

**یەکەم:** ئەو گومانانەی مەبەست پێیان لێدانە لە بنەڕەتی ئیسلام.

**دووەم:** ئەو گومانانەی کە مەبەست پێیان لێدانە لە بنەڕەتە چەسپاوەکانی شەریعەت نەوەك بنەڕەتی ئیسلام.

وەك پێشتر باسمان کرد جۆری یەکەم دابەش دەبێت بۆ چەند بەشێك، یەکەم بەشیش ئەو گومانانە بوون لەسەر بڕوابوون بە بوونی خوا و کەماڵی کردارەکانی خوا دەوروژێنرێن، پێش ئەوەی وەڵامی پرسیار و گومانەکانی ئەم بەشە بدەینەوە، باسی دوو بنەڕەت دەکەین کە پێویستە بگەڕێینەوە بۆیان هەتا سەرەتای وەڵامدانەوەی رەخنە و تێبینیەکان بن.

**یەکەم:** بەڵگەکانی بوونی خوا.

**دووەم:** حیکمەت لە کردارەکانی خوای گەورە.

## بنەڕەتی: بەڵگەکانی بوونی خوا

### یەکەم: بەڵگەی فیترەت:

**فیترەتی مرۆیی لە سێ ڕووەوە بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا:**

**ڕووی یەکەم:** هەندێ زانینی سەرەتایی هەن کە هەموو مرۆڤێك دەستی کەوتون بێ ئەوەی لە خوێندنگەدا فێریان بێت و لە زانکۆدا پێی وترابێت، بەڵکو لەگەڵ لەدایکبوونیدا هەبون و لە عەقڵیدا چێنراون، وەك زانینی ئەوەی هەر بەدیهێنراوێك دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت، بەش بچووکترە لە هەموو، ئەم زانیاریانە لە دوو ڕێگەوە دەبنە بەڵگە بۆ بوونی خوا:

**ڕێگەی یەکەم:** لە ڕوانگەی بینین و بەڵگەخوازیەوە، ئەویش بەوەی بڕوانرێت لە کەون و مرۆڤ و بەدیهێنراوەکان و بزانرێت ئەمانە بەدیهێنراون، پاشان بەو زانینە فیترەتیە بەڵگە بهێنینەوە کە دەڵێت هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەرێکی هەیە، کەواتە کەون و دروستکراوەکانیش خالق و بەدیهێنەرێکیان هەیە کە خوای گەورەیە.

**ڕێگەی دووەم:** تەنها بوونی ئەو غەریزە مەعریفیە فیترەتیانە بەڵگەن لەسەرئەوەی یەکێك ئەمانەی خستۆتە ناو دەروونی مرۆڤەوە، چونکە ئەوانە بە بەدەستهێنان و فێربوون بەدەستنەهاتون، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای بەدیهێنەر.

**ڕووی دووەمی بەڵگەبوونی فیترەت:** پێویستی ئاتاجی و بەندایەتی، یان داننانی پێویستی دەروونی بە پێویستیی خوای بەدیهێنەر، چونکە لە فیترەتی مرۆڤدا ئاتاجیەکی خۆیی هەیە بە هێزێکی پەنهانی تەواوەتی و دەوڵەمەند کە مرۆڤ داوای سوود و قازانجی لێ بکات و لێی بپاڕێتەوە بیپارێزێت لە خراپە و لەبەردەمیدا زەبوونیی خۆی نیشان بدات، بەتایبەت لەکاتی نارەحەتییەکاندا، بۆیە دەبینیت هەموو گەلانی پێشوو لە دێرزەمان و لە شوێن و وڵاتە جیاجیاکانەوە شوێنی پەرستشیان هەبووە، تەنانەت خۆر و هەسارە و ئاگر و داروبەردیان

پەرستووە هەتا بەو هۆیەوە بتوانن سوود وەدەست بخەن و خۆ لەزیان بپارێزن، ئەمەش تەنها لەبەر ئاتاجیی مرۆڤە بە پەرستراوێك کە داخوازی و پێویستیەکانی رۆحی پڕبکاتەوە، بەڵام ئەو کەشەی مرۆڤ تیایدا دەژی، لەوانەیە بەشدار بێت لە شێواندنی مەبەستە دروستەکە، ئیتر لەبری ئەوەی رووبکاتە پەرستراوی حەق، رووەدەکاتە هەندێ پەرستراوی باتڵ کە پێش دەقی شەرعی، بە عەقڵیش دەزانرێت کە پەرستنیان رەوا نیە، بۆیە پێغەمبەران کە نێردراون بۆ قەومەکانیان، چەقی پەیامەکەیان سەلماندنی بوونی خوا نەبووە، چونکە گەلان بە گشتی دانیان بەوەدا دەنا، ئەگەرچی هەندێ کەس جارجارە پێویستیان بەوەیە ئەو راستیە فیترەتیەیان وەبیربهێنرێتەوە، بەڵکو چەقی پەیامی پێغەمبەران بانگەوازکردن بووە بۆ یەکخواپەرستی و دەربازبوون لە پەرستشی جگە لە خوا، بۆیە دەبینین شێوازی گوتاری پێغەمبەران لەکاتی قسەکردن لەسەر ئەو راستییە فیترەتیە، بیرخستنەوە بووە نەوەك بناغەدانان و دامەزراندن، وەك ئەوەی بڵێیت فیترەت لە دەروونەکاندا زیندووبکەنەوە یان بێداری بکەنەوە، نەوەك بیچێنن یان بنیادی بنێن، بۆ نموونە بڕوانە لە فەرمایشتی خوای گەورە ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾،[١] (پێغەمبەرەکانیان پێیان وتن: مەگەر هیچ گومانێك هەیە لەسەر خوا کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە؟!)، ئەم شێوازە بۆ بیرخستنەوەیە نەوەك بۆ دانانی واتایەك کە پێشتر نەبووبێت.

هەرچەندە خەڵکانێك نکوڵیی لەوە دەکەن ئەو پێویستیە فیترەتیە هەبێت، بەڵام بێ هیچ دوودڵیەك لە دەروونەکاندا جێیی داکوتاوە و نکووڵیکردنیشی لە ملەجیرِەیی و خۆبەزلزانیەوەیە، یاخو بەهۆی خراپکردنی فیترەت و گۆڕینەوەیەتی بە چەند کارتێکەرێکی دەرەکیی، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا﴾،[٢] (رووی خۆت بە پاکی رابگرە و دامەزراو بە لەسەر ئایینی پاك و یەکخواپەرستی، ئەم ئایینە پاکە ئەو فیترەتە پاکەیە کە خوای گەورە خەڵکی خستۆتە سەری).

---

(١) - إبراهيم: ١٠.

(٢) - الروم: ٣٠.

هەروەها پێغەمبەری خوایش ﷺ دەفەرموێت (مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ)،[١] (هەر لەدایكبوویەك لەدایك دەبێت، لەسەر فیترەت لەدایك دەبێت، ئیتر دایك و باوكی دەیكەن بە جوولەكە یان مەسیحیی یان مەجووسی).

ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (داننان بە خوای بەدیهێنەردا فیترەتیی و پێویستی ناو دەروونی خەڵكە، ئەگەرچی هەندێ كەس تووشی حاڵەتێكی وا ببێت كە فیترەتەكەی بشێوێنێت بە چەشنێك پێویستی بە روانینێك بێت كە مەعریفەی پێ ببەخشێت).[٢]

لەوانەیە كەسێك بڵێت: مەگەر دەكرێت فیترەتەكان بشێوێنرێن؟ لە واقیعی بەرچاوەوە بەڵگە چیە لەسەر ئەوە؟

وەڵامی ئەوەش بریتیە لەوەی لە واقیعدا خەڵكانێك هەن نكوڵیی بنەما عەقڵیە یەكەمیەكان دەكەن و تەنها بڕوایان بە هەست هەیە هەتا كەوتوونەتە ناو بارودۆخێكەوە كە پێش گەورەكان، منداڵەكان دەخاتە پێكەنین، بۆ نموونە:

لە یەكێكیان دەپرسیت سەبارەت بە بینایەك كە لە بیست قات پێكهاتووە، لە قاتێكدا دە دەرچە هەیە، تاكە دەرچەیەك لەچاو سەرجەم بیناكەدا چ رێژەیەكی بەردەكەوێت؟ ئایا لە بیناكە گەورەترە یان بچووكترە؟ كەچی وەڵامەكەی ئەوەیە ئەو شتە نازانێت هەتا بە هەستی بینین بیناكە نەبینێت، ئینجا بڕیار دەدات!

بە پێوانە لەسەر ئەو كەسەی بەهۆی گومان یان دوودڵیەوە زانینە عەقڵیە یەكەمینەكانی شێواون و لەوەوە ئەو حاڵەتە سەرەتایی و فیترەتەی شێواوە، دەگەینە ئەوەی دەكرێت ئەو فیترەتەش بشێوێنرێت كە بانگەواز بۆ بوونی خوای گەورە دەكات، چونكە ئەو زانینە عەقڵیە سەرەتاییانەش مەسەلەیەكی فیترەتیە، بەڵكو وێناكردنی شێوانی فیترەت لە بواری داننان بە بوونی خوادا، بەرچاوترە لەوەی

---

(١) - صحيح البخاري، الرقم ١٣٥٨.

(٢) - مجموع الفتاوى (١٦/١٨٩).

تێڕوانینی لە زانینە عەقڵیە یەکەمینەکاندایە، لەبەرئەوەی گومانەکان لە یەکەمدا لەوەی دووەم زیاترن.

**رووی سێیەم:** غەریزە و رەوشت، چونکە دەبینین لەناو مرۆڤ و ئاژەڵیشدا برێك غەریزەی فیترەتی هەن کە لە کۆمەڵگەو دۆخ و کەشەوە بەدەستنەهاتون، بەڵکو بەبێ دەستکەوتنی لەلایەن خۆیانەوە تیایاندا هەیە، دەبینیت هەندێ ئاژەڵ لەگەڵ لەدایکبوونیاندا راستەوخۆ بەدوای شیردا دەگەڕێن و دەم بۆ گوان دەبەن، بەبێ ئەوەی دایکەکە فێری کردبێت کۆرپەکەی وابکات، هەروەها دەبینیت کاتێك ساوایەکی شیرەخۆر مەمکی دایکی پێ دەدرێت، خێرا دەزانێت چۆن بیمژێت و خواردنی لێ دەربکات، هەروەها غەریزەی حەزی دوو رەگەز بۆ یەکدی و غەریزەی هاوسەرگیریی و حەزی منداڵ و چەندین غەریزەی تر.

بیریاری ناسراو عەبدولوەهاب مسیری وتەیەکی زۆر جوانی هەیە لەو بابەتانەدا کە وایانلێکردووە دەست هەڵگرێت لە دیدی مادیگەری بۆ ژیان، لە گرنگترینیان:

کە دەیبینی ژنەکەی چەندە وابەستەیە بە کچەکەیەوە، وابەستەییەك کە سنووری ئامێرە مادیە بەستووەکانی تێدەپەڕاند، دەڵێت: مەگەر دەکرێت هەموو ئەمانە بە هۆی ئەنزیمەکانەوە بن؟[1]

لەو غەریزانەی لەناو مرۆڤدا چێنراون، بریتین لە بەها رەوشتییە چاکەکان وەك بەباشدانانی راستگۆیی و دادپەروەریی و رقبوونەوە لە ستەم و کوشتن و سزادانی منداڵ و شتی تری لەو چەشنە.

ناکرێت لە بازنەی پوچگەرایی و هەرەمەکی، لە بوونی چاکە لە دەروونی مرۆڤدا تێبگەین، بەڵکو تێگەیشتن لەمە بە رێکخستن و گونجاندنێ دەبێت لەژێر سایەی بڕوابوون بە خوایەکی کاربەجێ کە دەروونەکانی بەدیهێناوە و چاکە و خراپەشی پێ ئاشنا کردون.

---

(١) - لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ جاسم المطوع لە بەرنامەی (حدیث الذکریات) کە لە ئینتەرنێتدا دانراوە.

## دووەم: بەڵگەی هێنانەدی و دروستکردنی داهێنراوەکان:

ئەم بەڵگەیە بە ئاراستەی ئەو شتانەیە کە بەدیهاتوون، هەرچیەك کە بەدیهاتووە، ئەوە عەقڵ وادەخوازێت بگەڕێین بەدوای ئەوەدا کە بەدیهێناوە، ئەمەش لەسەر ئەم ریزبەندییە وەستاوە:

١- کەون بەدیهاتووەو مەخلووقاتیش لە نەبوونەوە بەدیهێنراون.

٢- هەموو بەدیهێنراوێك دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت.

٣-بۆیە کەون و مەخلووقاتیش بەدیهێنەرێکیان هەیە کە لە نەبوونەوە هێناونیەتە بوون.

ئەم بنەمایەش - مەبەستم: هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەرێکی هەیە- هەموو مرۆڤێك لە روانگەی کردەییەوە دانی پێدا دەنێت، ئەگەرچی هەندێ کەس بە زمان نکووڵیی لێ دەکەن، بۆیە دەبینیت لەدوای هەر هەبوویەکەوە کە پێشتر نەبووە، بەدوای بکەردا دەگەڕێین، دەبینیت پزیشکەکان بەدوای هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەو نەخۆشییانەدا دەگەڕێن کە پێشتر نەبون و تازە بڵاوبوونەتەوە، تەمەنی خۆیان لە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەدا سەرف دەکەن و دان دەنێن بەو بنەما عەقڵیەی کە باس لە هۆکارێتی دەکات، تەماشا دەکەیت زانایانی دەروونناسی و کۆمەڵناسی بەدوای ئەو هۆکارانەدا دەگەڕێن کە کێشە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانیان پەیدا دەکەن، تەنانەت دەبینیت کۆرپەی ناو بێشکە کاتێك گوێی لە دەنگێك دەبێت، بەملاولادا سەر دەجووڵێنێت و بەدوای سەرچاوەی دەنگەکەدا دەگەڕێت، ئیبن تەیمیە دەڵێت: (ئەو پێویستیەی زانراوە ئەوەیە کە بەدیهێنراو پاش ئەوەی پێشتر نەبووە، هەر دەبێت بەدیهێنەرێکی هەبێت، ئەم پرسە پێویستە، تەنانەت بۆ منداڵانیش بە فیترەت دیار و زانراوە، چونکە منداڵ ئەگەر کەسێك لێی بدات و ئەم ئاگای لە خۆی نەبێت و نەیبینێت، دەڵێت: کێ بوو لێیدام؟ ئەگەر پێی بوترێت: کەس لێی نەدایت، عەقڵی ئەوە قبووڵ ناکات لێدانەکە لەخۆوە بێت و کەسێك نەبووبێت).[١]

لەبەر هەموو ئەمانە، مرۆڤێك کە لەگەڵ فیترەتیدا تەبایە، پێویستی بەوە نیە لەسەر بوونی خوای بەدیهێنەر بەڵگەی بۆ بهێنیتەوە، چونکە بە رامان لە بەدیهاتنی

---

(١) - الفتاوی (٥/٢١٥).

کەون و مەخلووقات ئەوەی پێ دەڵێت و بەدوایدا پێویستیی عەقڵیی بەڵگەو دانپێدانان بە بوونی خوای بەدیهێنەر بەدوای خۆیدا دێنێت.

خوای گەورە دەفەرموێت (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ)،[1] (ئایا بەبێ هیچ شتێك و لە هیچەوە بەدیهێنراون؟ یان خوایەك هەیە بەدیهێناون).

هەروەها دەفەرموێت (أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئًا)،[2] (ئایا مرۆڤ ئەوەی لەبیرچووە کە ئێمە دروستمان کردووە پێش ئەوەی هیچ شتێك بێت و لە هیچی نەبووەوە بەدیمان هێناوە).

سەلماندنی بەدیهاتنی کەون، بەوجۆرە نەماوە کە قورسیەکی لەخۆ گرتبێت، چونکە لە نێوەندە زانستییەکانی ئەمڕۆدا کەسێکی وا نابینیت بڵێت کەون کۆن و ئەزەلیە، بۆیە نابینیت زانا مولحیدەکان لە بازنەی نکوولییان بۆ بوونی خوا، نکوولیی بکەن لە بەدیهاتنی کەون، بەڵکو بۆ ڕاڤەکردنی پەنا بۆ ئەوە دەبەن کە بڵێن دروستبوون و بەدیهاتنی کەون لە دەرەوەی بازنەی غەیبیی ئایینەوەیە.

لێرەدا دەرفەت نیە بە دوورودرێژی بەڵگەی زانستی بهێنینەوە لەسەر بەدیهاتنی گەردوون، دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر هەر سەرچاوەیەکی زانستی لەژێر ناونیشانی (فراوانبوونی گەردوون، یان کشانی گەردوون) هەروەها لەژێر ناونیشانی (یاسای دووەمی داینامیکی حەراریی).

لەو سەرچاوە گرنگانەی لە بواری سەلماندنی بوونی خوا و بەڵگەکانی فیترەت و عەقڵدا هەن، کتێبی (شموع النهار) ی شێخ عەبدوڵا صالح عجیرییە.

---

(١) - الطور: ٣٥.

(٢) - مریم: ٦٧.

ASTANA

## سـێیەم: بەڵگەی ئیتقـان:[١]

پاش ئەوەی عەقڵ بە بەڵگەی بەدیهاتنی بەدیهێنراوەکان، بوونی خوای بەدیهێنەری سەلماند، ئینجا بەڵگەیەکی تریش هەیە کە بابەتەکە بەهێزتر دەکات و هیچ گومان و دوودڵییەك ناهێڵێت، ئەویش بریتیە لەوەی ئەو بەدیهێنراوانە بابەتەکەیان تەنها بەدیهێنانیان نیە و بەس، بەڵکو هاودەم بەوەش، بە ئیتقانترین وێنە و باشترین شێوە دەردەکەون، ئیتقانێك کە هیچ توانایەکی مرۆیی پێ ناگات و ناتوانێت هاوشانی یان هاوشێوەی، شتی وابکات، ئالێرەدا عەقڵ هاواری ئەوە دەکات کە ئەم ئیتقان و توندوتۆڵییە ناکرێت بە صودفە بەرهەم هاتبێت و هەرلەخۆوە داهێنرابێت، بەڵکو تەنها و تەنها هێزی خوای گەورەی دانا و زانا و بەتوانایە.

وێنەی ئیتقان و توندوتۆڵی لە بەدیهێنراوەکاندا ناتوانرێت بە چەندین مەوسوعەی گەورەش نیشان بدرێت، بەڵکو هەر ناتوانرێت سنووردار بکرێت، هەرکات مرۆڤ زیاتر روانین و رامانی هەبێت بۆ خودی مرۆڤ و ئاژەڵ و زەوی و ئەوەی لەسەر زەوی هەیە و ئاسۆکان، زیاتر لەوە تێدەگات کە ئەو ئیتقانە هەرگیز لە خۆوە بەجێنە گەیشتووە.

بۆیە یەکێك لە گەورەترین پێناوەکانی زیادبوونی دڵنیایی لەسەر بوونی خوا، رامانە لە بەدیهێنراوەکان و تەماشاکردنی نیشانەکانی وردەکاریی و بەڵگەکانی جوانی و توندوتۆڵی دروستکردنی بەدیهێنراوەکانە، بەرنامە بەڵگەنامەییەکان دەرفەتێکی گەورە دەدەن بە بیریاران و ئەوانەی رادەمێنن، هەروەها ئەو کتێبە زانستیانەی کە باس لە ئەرکەکانی بەشەکانی جەستە و پێکهاتەی شانە و زانیارییە بۆماوەییەکان و هاوشێوەکانیان دەکەن، هەموویان شایەتیی ئەوە دەدەن کە ئەو بەدیهێنراوانە لە ئاستی ئەوپەڕی تەواوی و وردەکاریدا بەدیهێنراون، خوای گەورەش دەفەرموێت (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ)،[٢] (ئێمە نیشانەی تاك و تەنهایی

---

(١) - مەبەست بە ئیتقان، ئەنجامدانی ئیشێکە لەوپەڕی دروستیی و وردەکاریی و بێ کەموکورتیدا. وەرگێڕ.

(٢) - فصلت: ٥٣.

خوایان پێ نیشان دەدەین لە لووتکە و ئاسمان و لە خودی خۆیشیاندا هەتا بۆیان دەربکەوێت ئەم قورئانە حەقە و لای خوای گەورەوە هاتووە)، هەروەها دەفەرموێت (وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ، وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ)،[1] (لەسەرزەویشدا چەندەها نیشانەی ئاشکرا هەن لەسەر تاك و تەنهایی و دەسەڵاتی خوا بۆ ئەو کەسانەی یەقین و دڵنیاییان هەیە، لە نەفسی خۆیشتاندا چەندەها بەڵگە هەیە، بۆچی نابینن و هەستی پێ ناکەن).

لەو سەرچاوانەی باس لە زانینی ئیتقان و وردەکاریی لە بەدیهێنراوەکاندا دەکەن، بریتیە لە کتێبی (الله يتجلى في عصر العلم) کە گوڵبژێرێك لە زانایانی ئەمریکی بواری ژینگە نووسیویانە.

## چوارەم: بەڵگەی گرنگیپێدان:

پاش بەڵگەی بەدیهێنان و دواتر ئیتقان، بەڵگەی گرنگیپێدانیش دەبینین کە ئەمیش وەك دوانەکەی پێشوو، جەخت دەکاتەوە لە پێویستی بوونی خوایەکی بەدیهێنەری دانا و زانای میهرەبان، ئەم بەڵگەیە ئەگەر لە بازنە گشتیەکەدا بچێتەوە ناو بازنەی ئیتقان، بەڵام جێی خۆیەتی بە جیا باس بکرێت، چونکە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و بەدیهێنراوەکانی تر لەخۆدەگرێت، مرۆڤێك کە بە وردەکاریی دروستکراوەو ئەو بەدیهێنراوانەی تر کە بە جوانی و تەواویی بەدیهێنراون، وێڕای ئەوەی بەوچەشنە بەدیهێنراون، هاوکات دەبینیت لەبارکراون بۆ ئەوەی مرۆڤ سوودیان لێ وەربگرێت و بەهۆیانەوە پێویستیەکانی خواردن و دەرمان و سواربوون و گەشت و جەنگ و پیشەسازی و بنیادنان دابین بکات، ئەم گرنگیپێدانە بە مەبەستە نەوەك هەر لەخۆوە بووبێت، هەر لەسەرەتاوە کە لەناو سکی دایکیەوە بارودۆخی لەباری بۆ ڕەخساوە، هەتا لەدایکبوونی و دابینکردنی خۆراك بۆی لە سنگی دایکیدا و سۆزی دڵی دایکایەتی بۆی، پاشان دارودرەخت و ئاژەڵەکان بەپێی پێویستیەکانی مرۆڤ، لەباربکرێن بۆ خزمەتی مرۆڤ، زەوی بۆ لەبار بکرێت بۆ ئەوەی بە کون و کەلەبەر و بەرزی و نشێویەکانیدا بگەڕێت، بچێتە

(١) - الذاريات: ٢٠-٢١.

ناو دەریا، خۆر و مانگ و شەو و ڕۆژ هەماهەنگ بن لەگەڵ بەرژەوەندیی و پێویستیەکانی مرۆڤدا، پێدانی توانای عەقڵیی بە مرۆڤ هەتا بتوانێت بەهۆیەوە لە گەردوون تێبگات و زەوی پێ ئاوەدان بکاتەوە، زۆر نموونەی لەوە زیاتر هەن کە ئاماژەن بە بنەمای گرنگیپێدان و لەڕێی مەعریفە و رامانەوە درکیان پێ دەکرێت.

## بنەڕەتی دووەم: پێشەکیەکی گرنگ بۆ مامەڵە لەگەڵ ئەو پرسیارانەی پەیوەستن بە حیکمەت و دادپەروەری خواوە:

زانینی وەڵامی ئەو پرسیارانەی پەیوەستن بە کەماڵ و دادپەروەریی خوا و حیکمەت لە کردارەکانی پەروەردگار، تەنها کاتێك بە تەواوەتی ڕێ و جێی دروستی خۆی دەگرێت کە دان بنێین بە بەشێك لە بیروباوەڕەکانی پێشوو کە لەسەر بنەمای بەڵگەی یەکلاکەرەوە بنیادنراون، منیش بە ڕیزبەندیی باسیان دەکەم:

**یەکەم:** بڕوابوونی تەواو بە بوونی خوا، پێشتریش بڕێك بەڵگە لەوبارەوە باسکراوە.

**دووەم:** بڕوابوون بە کەماڵی خوا لە زاتی خۆی و کرداریدا، ئەمەش لەسەر ئەو تەواوکاریی و وردەکارییە دامەزراوە کە لە بەدیهێنراوەکان و ڕێکخستنیاندا دەیبینین، وەك چۆن هەندێ سیفەتی بەدیهێنراوەکان لە بەرهەمهێنانێکیاندا بە بەڵگە دەهێنینەوە، جا لە ڕوانگەی وێنەیەکەوە کە وێنەکێشێك دەیکێشێت، دەزانین ئەو کەسە داهێنەر و هەڵکەوتە و لێزانە، یان کەسێکی سەرەتاییە و ئیتقانی نیە.

**سێیەم:** داننان بەوەدا کە بەدیهێنراو توانا و زانست و حیکمەتی سنووردارە و بەدیهێنەریش زانست و توانا و حیکمەتی ڕەهایە، مرۆڤ بەردەوام فێری ئەو شتە دەبێت کە پێشتر نەیزانیوە، بۆیە دەبینین کەسێکی دی دێت و هەڵەی ئەوەی پێشوو ڕاست دەکاتەوە، لەکاتێکدا ئەو کەسەی پێشوو وایزانیوە ئەو شتەی ئەو ڕاستی و دروستی ڕەهایە، کەسی دووەم دێت و بنیادی ئەوەی پێشوو ڕادەماڵێت و داروپەردووی رووخاوی پێشوو بنیاد دەنێتەوە، بیردۆزەیەك دێت و ئەو بیروباوەڕە هەڵدەوەشێنێتەوە کە پێشتر وادەزانرا ئەوە حەقیقەتە، ئەمەش بەهۆی دەستەوسانی مرۆڤ و سنوورداری توانا و زانستیەوەیەتی.

بەڵام خوای بەدیهێنەر ئەو شتەی داهێناوە کە مرۆڤ نەیتوانیوە بیکات، قەزایەکی داناوە کە هەموو مرۆڤەکان ناتوانن ڕێی لێبگرن، تنۆکێك لەم گەردوونەدا، لەبەشی بینراو یان نەبینراویدا، خوای گەورە بەڕێوەی دەبات، لەهەمان ئەو کاتەی کە گوێ لە نزا دەگرێت و وەڵامی دەداتەوە، ستەملێکراویش سەردەخات و ستەمکاریش لەناودەبات و ڕۆزیی دابەش دەکات، دەسەڵات دەبەخشێت بە هەرکەسێك بیەوێت و لە هەرکەسێکی وەردەگرێتەوە کە خۆی بیەوێت، بۆیە کردارەکانی خوا سەر بە زانستی ڕەهای خوان، بڕیارەکانی بەدیهێنراویش سەر بە زانستی سنوورداری بەدیهێنراون، بۆیە بەدیهێنراوێك کاتێك نارەزایی دەردەبڕێت بەرامبەر بە بەدیهێنراو، لەسەر بنەمایەکی پەست و لاواز دامەزراوە.

ئەگەر دەستەوسانی مرۆڤ لەوەدا بێت کە نەتوانێت لەوە تێبگات کە بە رووکەش پەیوەندی هەیە بە بەدیهێنراوەکانەوە، ئەوە بەدڵنیایی زیاترەوە دەستەوسان دەوەستێت لەوەی پەیوەستە بە خوای بەدیهێنەرەوە، بۆیە ناتوانین بە تەواوی هەموو شتێك لەسەر زات و سیفاتی خوا بزانین، تەنها ئەوە دەزانین کە پێمان وتراوە.

**چوارەم:** بڕوابوون بەوەی خوای گەورە کۆمەڵێك لە پێغەمبەرانی ناردووەو سروشێکی بۆ دابەزاندون هەتا خەڵکی بەهۆیەوە بتوانن بەدیهێنەری خۆیان بناسن و بزانن خوای گەورە بۆچی دروستی کردون، خوای گەورە بە بڕێك شت پاڵپشتی ئەو پێغەمبەرانەی کردووە کە راستگۆییان دەسەلمێنێت، وەك ڕەوشتی بەرز و راستگۆیی و راستاڵی و دوورگرتن لە گومان و دوودڵی، وێڕای ئەو نیشانەو موعجیزانەی پێی بەخشیون هەتا ببێتە بەڵگەیەکی تر لەسەر راستێتیی پێغەمبەرایەتی و راستگۆییان.

هەرکات ئەمە سەلما، ئیتر هیچکەس نیە لە خوا شارەزاتر بێت بە وەڵامی ئەو پرسیارانەی پەیوەستن بە حیکمەت لە کارەکانی خوا، خواش لەو کتێبەیدا ئەوانەی روون کردۆتەوە کە وەك ڕووناکی و ڕێنموونی بۆ خەڵك دایبەزاندووە، بۆیە ڕێگەی زانیاری دورست لەم بوارەدا بریتیە لە سەرچاوەی خوایی، نەوەك زانیاریی سنووورداری مرۆیی.

زانینی هەموو ڕاستیەکانی پێشوو، وامان لێدەکات باوەڕمان هەبێت بەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووەو خۆمان بدەین بەدەست ئەو زانیاریانەی قورئان و سوننەتەوە کە سەبارەت بە حکیمەتی کارەکانی خوا هاتووەو ئێمە نەمانزانیوە، هەتا خۆمان بەدەستەوە بدەین و هەڵوێستێکی دروستی عەقڵیمان هەبێت، ئەوکاتە خۆبەدەستەوەدان ڕاکردن نیە لە حەقیقەت، بەڵکو لەسەر بنەمای بەڵگەی عەقڵیی دامەزراوە.

نموونەیەکی جوانی واقیعی هەیە کە ئەو بابەتەی پێشوو ڕوون دەکاتەوە:

ئەگەر مۆبایلێکمان لەبەردەستدا بێت کە کۆمپانیایەکی ناسراو بە ئیشی جوان و وردەکاری دروستی کردبێت، وەك (ئەپڵ) یان (سامسۆنگ)، دواتر پارچەیەکی تێدا ببینین کە نەزانین سوودەکەی چیە، هەرگیز ناڵێین ئەمە بێسوودە، بەڵکو بۆ هۆکاری بوونی ئەو پارچەیە دەگەڕێین، چونکە پێشتر -بەهۆی بەرهەمەکانی کۆمپانیاکەوە- زانیومانە ئەو کۆمپانیایە هەرگیز لەخۆوە و بێسوود شت دروست ناکات.

ئەم گەردوونە گەورەش کە لەسەر سیستمێکی جوان و پڕ وردەکاریی دامەزراوە، ئاوایە، هەروەها ئەو بەدیهێنراوانەی کە لەوپەڕی وردەکاریدا بە جوانی بەدیهێنراون و لەسەر سیستمێك بنیاد نراون کە هیچ سیستمێکی مۆبایل و هاوشێوەکانی پێ ناگاتەوە، ئەو سیستمە بەڵگەی ئەوەیە کە بەدیهێنەرەکەی کەماڵی زانست و توانا و حیکمەتی هەیە.

جا ئایا دروستە لەپاش ئەوە ئەگەر لە حیکمەتی شتێك لەم گەردوونەدا تێنەگەیشتین، بڵێین بێسوودە، یان هیچ حیکمەتێك نیە لە بوونیدا؟! بێگومانە عەقڵی ساغ و پێوانەی دروست شتی وای لا پەسەند نیە.

پاش ئەم دوو پێشەکییە لەسەر بوون و کەماڵی خوا، لەژێر ڕۆشنایی ئەم دوانەدا مامەڵە دەکەین لەگەڵ هەموو ئەو گومانانەی لەسەر بوونی خوا و حیکمەتی کارەکانی خوا دەورووژێنرێن، شتێکی هەڵەیە دوور لەو بنەمایانەی پێشوو مامەڵە بکەین لەگەڵ هەر پرسیارێکدا کە پەیوەستە بە حیکمەتی خواوە.

# جۆری یەکەم
# گومانەکان سەبارەت بە بنەڕەتی ئیسلام

## بەشی یەکەم: گومانەکان لەسەر بوونی خوا و حیکمەتی کارەکانی

### لقی یەکەم گومانەکان لەسەر بوونی خوا:

لەم لقەدا چوار گومان دەخەینەڕوو و وەڵامی هەرکامیشیان باس دەکەین.

### یەکەم: پرسیار: کێ خوای بەدیهێناوە؟

زۆربەی جار مولحیدەکان بۆ ڕەخنەگرتن لە بەڵگەکانی بوونی خوا، دەپرسن: کێ خوای دروست کردووە؟ خودی ئەم پرسیارە پووچ و نادروستە، چونکە وەك ئەوە وایە بڵێیت: ئایا ماوەی سکپڕیی پیاو وەك ئافرەت نۆ مانگە؟ یان کێشی پلەی گەرما چەندە؟ یاخود پرسیاری تری هەڵەی لەو چەشنە.

ئەم پرسیارە سەبارەت بە بەدیهێنەرێکە کە ناکرێت بەدیهێنراویش بێت، خوای گەورە بەدیهێنەرە نەوەك بەدیهێنراو هەتا پرسیاری ئەوە بکرێت کێ بەدیهێناوە؟

کێشەیەکی تری پرسیارەکە ئەوەیە کەلەسەر ئەو بنەمایە دامەزراوە، یەکسانی دەکات لەنێوان بەدیهێنەر و بەدیهێنراودا، وەك چۆن یەکسانی دەکات لەنێوان بنەمای (هەموو ڕووداوێك ئەنجامدەرێکی هەیە) و قسەی هەندێ کەس کە دەڵێن: (هەموو هەبوویەك بەدیهێنەرێك هەیە)، هەردوو یەکسانکردنەکەش هەڵەن.

بەڵگەیەکی تری نادروستی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە وادەخوازێت هەر لە بنەڕەتدا گەردوون نەبوویێت، دیارە پرسیاری (کێ بەدیهێنەری بەدیهێنا؟) لەپێش ئەم پرسیارەوە نیە کە دەپرسێت (کێ بەدیهێنەری بەدیهێنەری بەدیهێنا؟)، ئینجا (کێ بەدیهێنەری بەدیهێنەری بەدیهێنەری بەدیهێنا؟) بەو شێوازە دەڕوات و

ناوەستێت، بەم چەشنە ئەم گەردوونە بوونێکی نابێت، چونکە ئەگەر بوونی بەدیهێنەری ئەم گەردوونە بەسترابێتەوە بە بوونی بەدیهێنەرێك لە پێش ئەوەوە ئەویش بەدیهێنەرێکی هەبووبێت، و ئەوەشیان بەدیهێنەرێکی تری هەبووبێت، ئاوا ناگەینە کۆتا، ئەوکات وادەخوازێت بوترێت بەدیهێنەرێك نەبووە ئەم گەردوونەی دروست کردبێت، چونکە بەدیهێنەری یەکەم دیار نیە کە سەرچاوەی هەموو بەدیهێنانەکان بێت، بۆیە زنجیرەکە بەردەوام و بێکۆتایە، ئەوکات گەردوونیش بوونی نابێت، مەگەر ئەوەی سەرچاوەی یەکەمی بێ سەرەتا هەبێت.

لێرەدا گەورەیی قورئان و بەخششی خوا بەسەرمانەوە بە ناردنی موحەممەد ﷺ دەردەکەوێت، لە قورئانی پیرۆزدا لەناوەکانی خوادا ناوی (الأول) هاتووە، وەك چۆن لە سوورەتی حەدید ئایەتی سێ دا هاتووە، لە صەحیحی موسلیمیشدا لە نزاکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کە دەیفەرموو (اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ)،[١] (خوایە تۆ یەکەمیت و پێش تۆ شتێکی تر نەبووە)، هەموو ئەمەش حیکمەتی ئەو چارەسەرەی پێغەمبەر ﷺ دەخاتەڕوو کە لە فەرموودە صەحیحەکەدا هاتووە دەفەرموێت (يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ: مَنْ خَلَقَ كَذَا مَنْ خَلَقَ كَذَا حَتَّى يَقُولَ: مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ وَلْيَنْتَهِ)،[٢] (شەیتان دێتە لای یەکێکتان و پێی دەڵێت: کێ ئەوەی بەدیهێنا؟ ئەی کێ ئەوەی بەدیهێنا؟ هەتا دەڵێت ئەی کێ پەروەردگارتی بەدیهێنا؟ هەرکامتان گەیشتە ئەو ئاستە، با پەنا بە خوا بگرێت و لەوێدا بوەستێت و کۆتایی پێ بهێنێت).

ئەم فەرموودەیە ئەوە روون دەکاتەوە کە پرسیارەکە هەر لە سەرەتاوە هەڵەیە و بیرکردنەوە تیایدا هەرگیز ناتگەیەنێتە ئەنجامێکی ئەرێنی، مەگەر ئەوەی بگەڕێیتەوە سەر ئە وبیروباوەڕەی کە لەسەر زاری شەرع سەبارەت بە سیفەتی خوای گەورە هاتووە.

---

(١) - صحيح مسلم، الرقم ٢٧١٣.

(٢) - صحيح البخاري، الرقم ٣٢٧٦.

ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (ئەگەر بەندە گەیشتە کۆتای مەبەستەکان و ئەخیری کۆتاییەکان، پێویستە ئیتر بوەستێت، ئەگەر دوای ئەوە بەدوای شتێکی ترەوە بێت، پێویستە کۆتایی پێ بهێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە بەندەی -خوا- هاودەم بەوەی پەنا بگرێت بە خوا لە وەسوەسەی زنجیرەیی، لەوێدا کۆتایی پێ بهێنێت، وەك چۆن هەرکەس بگاتە کۆتایی داواکراو و ئەوپەڕی ئامانج، داوای لێ دەکرێت لەوێدا کۆتایی پێ بهێنێت).[١]

ئەو بنەمایەش کە دەڵێت (هەموو هەبوویەك بەدیهێنەرێکی هەیە) دروست نیە، چونکە راستەکەی ئەوەیە هەموو رووداوێك ئەنجامدەرێکی هەیە، سەلماویشە ئەم گەردوونە رووداوەو هەر دەبێت ئەنجامدەرێکی هەبێت.

## دووەم: بانگەشەی بێباك بوون بەهۆی یاسا گەردوونیەکانەوە:

هەندێ مولحید بانگەشەیەکی بێ بەڵگە بڵاو دەکەنەوە، بەڵکو بەڵگە سەرلەبەری بانگەشەکە هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن: ئەو یاسا وردانەی کە گەردوونیان لەسەر دەڕوات، بێمنەتمان دەکەن لەوەی بڵێین گەردوون بەدیهێنەرێکی هەیە، گەردوون لە سایەی ئەو یاسایانەدا، خۆی خۆی دامەزراندووە.

ئەم قسەیە هەڵە و بەزاندنی راستیەکی گرنگی لەخۆگرتووە، ئەویش ئەوەیە کە یاساکان وەسف و راڤە دەکەن نەوەك دامەزرێنەر و بەدیهێنەر بن، مەگەر دەکرێت بڵێین: لەبەرئەوەی مامەڵە داراییەکان یاسای ژمێریاریان هەیە، ئیتر ئەو یاسایانە دەتوانن شوێنێکی بازرگانیی دابمەزرێنن؟

یان بۆ یاساکانی میکانیك بڵێین دەتوانن ئۆتۆمبێل دروست بکەن؟ یاخود ئەو یاسایانە پێویستیان بە دروستکەرێکە هەتا جێبەجێیان بکات.

ئایا یاسای راکێشان بەدیهێنەرە یان ئیشی راڤەکردنە؟

---

(١) - درء تعارض العقل والنقل (٣/٣١٤-٣١٥).

بوونی یاسایەك راڤەی دیاردەیەکی دیاریکراو دەکات، نەوەك نکووڵی لە بوونی هۆکاری دامەزراندنی، ئێمە کە شارەزاییمان هەبێت بەو یاسایانەی فرۆکە بەهۆیانەوە کاردەکات و دەفڕێت و دەنیشێتەوە، ئەمە واناکات دروستکەرێکی نەبێت، بۆ گەردوونیش بە هەمان شێوە.

مەسەلەیەکی تریش ئەوەیە کە ئەو بانگەشەیە تێپەڕاندنی پرسیارێکی پێویستی عەقڵیی لەخۆگرتووە، ئەویش ئەوەیە: کێ ئەو یاسایانەی دانا؟ کێ وایکرد گەردوون بە پێی ئەو یاسایانە کاربکات؟

## سێیەم: بیردۆزەی پەرەسەندنی داروینی:

لێرەدا کە بە کورتی شتەکان باس دەکەم، ناتوانم بەشێوەیەکی تێروتەسەل مشتومڕی بیردۆزەیەك بکەم کە بەشێکی دیاری جەدەلی ئایینی زانستی داگیرکردووەو یەکێکە لە گرنگترین ئەو بەڵگانەی کە مولحیدەکان پشتی پێ دەبەستن بۆ راڤەی هەمەچەشنەیی کائینە زیندووەکان بەبێ ئەوەی پێویست بە بوونی خوای بەدیهێنەر بکات،[1] وەك چۆن مولحیدی بەناوبانگ ئەنتۆنی فلو لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمدا باسی دەکات و دواجاریش لە کۆتایی ژیانیدا دانی نا بە بوونی بەدیهێنەرێکدا.

لای هەندێ کەس ئەو بیردۆزەیە بووە بە بیروباوەڕێك کە جێی جەدەل و مشتومڕ نیە، وێڕای ئەوە تاکە راڤەی سروشتیە بۆ سەرهەڵدانی کائینە زیندووەکان لەبەرامبەر بڕوابوون بە بوونی خوای بەدیهێنەردا، ئەمەش وای لە ناوەندی زانستیی کردووە -کە راڤەی ماددی لەلا پەسەندترە- زیاتر دەستی پێوەبگرێت و زیادەڕەوی بکات لە گەورەکردنی و پشت پێبەستنیدا.

ململانێی سەدەکانی کۆتایی لەنێوان زۆرێك لە کەسە دیارەکانی زانستی سروشتی و ئایینی کڵێسایی لاڕێبوو، وایکرد هەرلایەکێیان دەست بگرێت بە دیدی جیاوازی خۆی و رێبازی راڤەیی تایبەت بە خۆیەوە بۆ هەبووەکان، تیایدا زانایانی

---

(١) - رحلە عقل، عمرو شریف، ص ٦٦.

سروشت هەوڵیاندەدا راڤە غەیبییەکانی ناو دیدی کڵێسا لە دوور لە راستی نیشان بدەن، ئەمەش وایدەکرد بێلایەنبوونی کۆمەڵگەی زانستیی سروشتی ورد و دروست نەبێت.

ئەو بیردۆزەیە نەگەیشتە ئاستی حەقیقەتی زانستی، وێڕای ئەوەی بەڵگەکانی لەرووی بەهێزی و لاوازییەوە جیاواز بوون، ئەمەش بەپێی جۆری ئەو پەرەسەندنەی کە وەك بەڵگەیەك بەدەستیانەوە بوو، بەڵگەکانی پەرەسەندن لەناو هەمان جۆردا، بەهێزتر بوون لە بەڵگەکانی پەرەسەندن لەنێوان جۆرە جیاوازەکاندا.

رەخنەگرتن لە بیردۆزی پەرەسەندن تەنها لە بازنەی ئاییندا نەوەستا، بەڵکو زانایانی ئەزموونیش هەبوون کە رەخنەیان لێ دەگرت و کەلێنی گەورەی ئەو بیردۆزەیان خستەڕوو و چەندین تەحەددا و رەخنەیان بەرامبەری باسکرد، لەوانەش د. مایکل بیهی کە مامۆستا کیمیای زیندەیی بوو لە زانکۆی لیهای لە پەنسلڤانیا، لەو بارەشەوە کتێبێکی نووسی بەناونیشانی (سندووقی رەشی داروین) ئەو کتێبە لە نێوەندە هزرییەکاندا هەرایەکی نایەوە، سەرەتاکەی بە وتەیەکی خودی داروین لە کتێبەکەیدا (بنەڕەتی چەشنەکان) دەستپێدەکات (ئەگەر گونجاو بێت بوونی هەر پارچەیەکی ئاڵۆز بسەلمێنرێت کە وا تەماشا ناکرێت لە رێگەی چەندین گۆڕانکاریی یەك لەدوای یەکەوە بووبێت، ئەوە زۆر ناخایەنێت، سەرلەبەری بیرۆدزەکەم دادەڕمێت).

د. مایکل بیهی لە کتێبەکەیدا بە وردی باسی ئەوپەڕی ئاڵۆزی خانە دەکات، لەمەشدا لەگەڵ ئەو قسەی داروینا یەکدەگرێتەوە.

ناوەندی بەراهین کتێبەکەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و ناوەندی تەکوینیش لە دوو توێی کتێبێکی (٤٣٠) لاپەرەییدا چاپی کردووە.

چەند کتێبێکی تری زانایانێکی رۆژئاوایی هەن کە لە دیدگایەکی زانستییەوە رەخنەیان لە بیردۆزەکە گرتووە، لەوانەش:

کتێبی (ایقونات التطور) لە نووسینی جوناسان ویلز، توێژەرانی ناوەندی بەراهین ئەم کتێبەشیان وەرگێڕاوەو لەبارەیەوە دەڵێن (پەیامی بنەڕەتی کتێبی ایقونات

التطور لەسەر دوو بیرۆكەی ریشەیین، یەكەمیان نیشاندانی توانای شارەزایانی زانستی سروشتی لەوەی هەركات ویستیان، یان بە پێویستیان زانی، زانست بەشێوەیەكی ئایدۆلۆجیایی سەركوتكەر و دەسەڵاتداری خۆسەپێنی بەكاربهێنن، بیرۆكەی دووەمیش ئەوەیە كە نیشانی بدەن ئەكرێت خودی زانستی سروشتی لەروانگەی ئەگەر و بیردۆزە و پشتیوانەكانیەوە ببێتە بڕێك ئەفسانەی خاوەن هێما و ئایقۆن و گێڕانەوەو بەسەرهات و ئاماژە و هێمای تایبەت).[١]

كتێبێكی تریش هەیە بە ناونیشانی (زانست و بنەڕەتی مرۆڤ) كە سێ زانا پێكەوە دایانناوە (ئان گوگر، دۆگلاس ئیكس، كیسی لسكین) كتێبەكە رەخنەگرتنە پەرەسەندنی داروینی، هەروەها كتێبێكی تری زۆر گرنگ بە ناونیشانی (تصميم الحياة) لە نووسینی د. ویلیام دیمبسكی و د. جوناسان ویلز.

پێم خۆشە سەرنجات بۆ ئەوەش رابكێشم كە هەندێ توێژەری موسڵمان كە هەوڵیانداوە بەر بگرن بە بیری ئیلحادی، نەویونەتە بیرۆكەی گونجاندنێك لەنێوان بیردۆزەی پەرەسەندن و ئیسلامدا، ئەمەش لەبەرئەوەی بڕوایان وابووە پەرەسەندنی چەشنەكان لە رووی زانستییەوە شتێكی چەسپاوە، بەڵام لە بنەمای عەشوائیدا (هەڵبژاردنی سروشتی) لەگەڵ مولحیدە داروینیەكاندا هاوڕا نین، ئەو موسڵمانانە بڕوایان بە پەرەسەندنی ئاڕاستەكراو هەیە، واتە پێیان وایە خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو شتێكە، بەڵام لە رێی سوننەتی پەرەسەندنەوە، هەندێكی دیكەیان دەڵێن: كێ رێگریی لە خوا دەكات لەوەی لە رێی پەرەسەندنەوە بەدیهێنراوەكانی خۆی بەدیهێنێت؟

ئەم جۆرە بۆچوونە زۆرجار لە بابەتی خەلقی ئادەمدا لەگەڵ شەرعدا بەریەككەوتنی بۆ دروست دەبێت، چونكە دەقە قورئانیەكان بە روونی ئاماژە بەوە دەدەن خوای گەورە راستەوخۆ ئادەمی خەلق كردووە بەبێ ئەوەی باوك و دایكێكی هەبووبێت، واتە لە ئەنجامی پەرەسەندنی بەرەبابێكی پێشووەوە نەبووە كە لە مرۆڤ چووبێت.

---

(١) - أيقونات التطور، ص ١٣.

خوای گەورە دەفەرموێت (إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ)،(١) (نموونەی عیسا لەلای خوای گەورە وەك نموونەی ئادەم وایە، خوای گەورە ئادەمی لە خۆڵ دروست کرد و پاشان پێی فەرموو ببە، یەکسەر دروست بوو).

یەکێك لەو کەسانەی راوبۆچوونی ئەو کەسانەی هێناوەو بە رەخنەوە لەسەر بەڵگەکانیان دواوە، دکتۆر هاشم عەزمییە لە کتێبەکەیدا (التطور الموجه) کە لە مەرکەزی بەراهین چاپ کراوە، هەروەها سولتان عومێری لە تێزی دکتۆراکەیدا.

## چوارەم: بیردۆزی چەند گەردوونەکە:

گفتگۆیەك ئەنجام درا لەنێوان ریتشارد داوکینز (سەرگەورەی مولحیدانی سەردەم) و ستیڤن واینبۆرگ (لە دیارترین فیزیازانەکانی جیهان کە ئەمیش مولحیدە)، گفتگۆکەش لەسەر بیردۆزەی چەند گەردوونەکە بوو، داوکینز هیوای وابوو لە کەسی شارەزاتر لە خۆیەوە شتێك ببیستێت کە ئەو بیردۆزەیە بەهێزتر بکات، بەڵام بێهیوا بوو، ئەمەش دەقی گفتگۆکە بوو:

(داوکینز: من رای زانایانی فیزیام لا پەسەندە کە جۆرێك لە رێکخستنی ورد هەیە، هەوڵمداوە سێ راڤەی ئەگەری دابنێم، یەکێکیان: خودا، پاشان وتم ئەمەیان راڤە نیە، دووەم: بیردۆزی چەند گەردوون، ئێمەش لە یەکێك لەو گەردوونانەداین.

سێیەمیش داومەتەوە پاڵ تۆ.

واینبۆرگ: ئۆۆهـ، نا،

داوکینز: لەوانەیە بە هەڵە.

واینبۆرگ: خۆزگە دەخوازم شتی وات نەکردبێت.

داوکینز: ئەوەم ناونانوە فیزیایی بوێر، ئەمەش ئەوەیە کە پێی وایە ئێمە هەتا ئێستاش نازانین ئەم شتانە (چەسپاوەکان) بۆچی ئاوەهان؟ رۆژێك دێت کاتێك

---

(١) آل عمران: ٥٩.

بیردۆزەی هەموو شتێکمان هەیە لێی تێدەگەین، بەڵام لەوانەیە لەکاتی ئەم دیمانەدا، من ناشیرین لەبری تۆ قسەم کردبێت.

واینبۆرگ: پێم وانیە کەسمان بۆی هەبێت ئەم چالاوە بە کەم بگرێت کە تیایدان، دواجاریش هەرگیز ناتوانین راڤەی جیهان بکەین.

کۆمەڵێك یاسای سروشتی هەن کە ئەتوانین کاتێك بیانگۆڕین بۆ یاسای بیرکاری، لێیان تێبگەین، چونکە دەکرێت دەستمان بگات بە یاسای بیرکاری، بەڵام وەك دەزانین راڤەی جیهان ناکات.

هەمیشە پرسیارێك دەمێنێتەوە، بۆچی یاسا سروشتیەکان ئاوان کە ئێستا هەن و جیاواز نین، هیچ دەرچەیەکیش بۆ دەرچوون لەمە بەدیناکەم.

داوکینز: بیرۆکەی کۆتایی کە زۆربەی فیزیاییەکان برێك کاتی پێ دەدەن و پێم وایە بریتیە لە بیردۆزەی چەند گەردوونەکە.

واینبۆرگ: هیچکەش ئەوەی بە بیردۆزەیەکی راستەقینە دانەناوە، ئەوە تەنها بە مەزندە نیە، چونکە بیردۆزەکە بە مەزندە دانراوە، بەڵام ئێمە بیردۆزەیەکمان لا نیە کە بتوانین بەهۆیەوە لە چەند یاسایەکی بیرکاریدا مەزندە دابنێین، بەڵکو ئەوانە بیردۆزەی ئەگەرین.

داوکینز: لە راستیدا لەکارخستنەکە زۆر وردە، واتە ژمارەی ئەو گەردوونانە دەبێت زۆر زۆر بێت هەتا بتوانین بڵێین گەردوونی ئێمەش لەنێویاندایە.

واینبۆرگ: پێویستە بەلایەنی کەمەوە ژمارەیان دە دانە بێت و هێزیان بگاتە ٥٦، ئەگەریش بیرۆکەیەکت لایە سەبارەت بە تەرەدوداتی نێو ماوە کورتەکان، ئەوە دەبێت ژمارەیان بە لایەنی کەمەوە ١٠ دانە بێت و هێزیان بەرز بێتەوە بۆ هێزی ١٢٠، لەراستیدا ئەمەش شتێکی بێزارکەرە).

بیردۆزەی چەند گەردوونەکە، لەو بیردۆزانەیە کە تاقمێك لە مولحیدەکان دەمارگیرییان بۆی هەیە و پێیان وایە دەرچەیەکە هەتا بتوانن راڤەی سەرهەڵدانی ئەم گەردوونە گەورەی پێ بکەن و خۆ دووربگرن لە داننان بە بوونی خوایەکی بەدیهێنەردا.

ASTANA

بۆیە ئەو گفتگۆیەی نێوان داوکینز و واینبۆرگم هێنا، بۆ ئەوەی بیسەلمێنم ئەو بیردۆزەیە لە رووی زانستیەوە شوێن پێی جێگیر نەکردووە و گەورە مولحیدە فیزیاناسەکانی وەك ستیڤن واینبۆرگیش دانیان پێدا نەناوە، لە ماڵپەری یوتیوبیشدا سێ ڤیدیۆ هەن کە بە هەموویانەوە تێڕوانینێکی وردتر سەبارەت بە ئەگەر و بیردۆزەکە دەبەخشن و تیایدا بەرپەرچی هەرکەس دەدەنەوە کە ئەو ئەگەرە وەك بەڵگەیەك بۆ مولحیدبوونی خۆی بەکاردەهێنێت، ئەو سێ پارچە ڤیدیۆیەش بریتین لە:

ئەڵقەیەکی گفتگۆی نێوان د. موحەممەد عوەزی و پرۆفیسۆری فیزیاناسی موسڵمان موحەممەد سالم تائی بە ناونیشانی ( فرضية الأكوان المتعددة والموازية).

ڤیدیۆیەك بە ناونیشانی (الأكوان المتعدده) ی رەشاد قەرەنی لە بەرنامەکەیدا (ارجع لأصلك)، ئەم برایە لە بەرنامە ناوازەکەیدا، کۆمەڵێك مشتومڕی باشی هەیە سەبارەت بە هەندێ بەخششی زانستی کە ژمارەیەك لە مولحیدەکان وەك بەڵگە بەکاریان دەهێنن.

وەك دەبینیت کەسی مولحید لە ئامادەباشی ئەوەدایە ئەم کەونە بەهەر هۆیەك بەدیهاتبێت تەنها ئەوە نەبێت کە خوای بەدیهێنەر دروستی کردبێت، واینبۆرگ بەهۆی بڕوابوونی بە خوای گەورە، زۆر بێمنەتە لەم هەژمارە بێزارکەرە.

## لقی دووەم: گومانەکان سەبارەت بە حیکمەتی کارەکانی خوا:

ئەم بابەتە لەو بابەتانەیە کە زۆرترین پرسیاری لەبارەوە دەکرێت و چوار پرسیاری -سەرەکی- لەخۆدەگرێت:

١- بۆچی بەدیهێنراوین و فەرمانمان پێ کراوە پەرستش بکەین؟

٢- بۆچی خراپە لە جیهاندا هەیە؟

٣- بۆچی گیرابوونی نزا دوادەکەوێت یان هەر نایەتەدی؟

٤- چۆن دادپەروەری خوایی و قەزاوقەدەر و نووسینەوەی کرداری بەندەکان پێکەوە دەگونجێن؟

پێشتریش وتمان کە ئەم بابەتە تەنها کاتێك جوان و دروست لێی تێدەگەین کە پێشوەختە بڕوامان هەبێت بە چەند شتێك کە لە باسی حیکمەتی کارەکانی خوادا باسم کردووە، چونکە وەڵامەکە لەسەر ئەو بنەڕەتانە وەستاوە.

## پرسیاری یەکەم: بۆچی خوای گەورە بەدیهێناوین. بۆچی فەرمانمان پێ دەکات بە پەرستش لەکاتێکدا پێویستی بە ئێمە نیە؟

پێویستە پێش ئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، بگەڕێینەوە سەر ئەو پێشەکییانەی لە باسی حیکمەتی کارەکانی خوادا باسمان کردن، چونکە هەر پرسیارێك پەیوەست بێت بە حیکمەتی کارەکانی خواوە، ناکرێت بێ ئەو پێشەکییانە قسەی لەسەر بکرێت، پاش ئەوە دەتوانین لە چەند خاڵێکدا وەڵامێکی پوخت و تەواوەتی بدەینەوە:

**یەکەم:** بەدیهاتنی گەردوون و ئەوەی تیایدایە، عەقڵ سەرسام و دڵەکان شۆك دەکات، مرۆڤ ناتوانێت لە بچووکترین بەدیهێنراوی گیانلەبەری خوا لەم گەردووونەدا -کە مێشوولەیە- کێبڕکێی خوا بکات، هەموو شتێك لەم گەردوونەدا هاوار بۆ کەماڵی ئەو زاتە دەکات کە بەو وردەکاری و ڕێکوپێکیەوە بەدیهێناوە.

**دووەم:** پاش ئەوەی ئەو ڕێکوپێکی و وردەکاریی و گەورەییەمان بینی، کامیان تێروتەسەلترە؟ حیکمەت لەو بوونە یاخود هەوانتەیی؟ بێگومان هاودەم بە بوونی ئەو هەموو ڕێکوپێکی و وردەکاری و یاسا لەتوانابەدەرانە، بوونی حیکمەت و ئامانج، لەگەڵ عەقڵی بەدیهێنراودا دەگونجێت.

**سێیەم:** عەقڵ وادەخوازێت ئەو ئامانج و حیکمەتە لەگەڵ کەماڵی بەدیهێنەری ئەو شتە گەورانەدا کۆك و تەبا بێت، ئەو شتانەی کە گەورەیی بەدیهێنەرەکەیان و ئەوپەڕی حیکمەت و کەماڵی ئەو پەروەردگارەمان نیشان دەدەن.

**چوارەم:** لە تەواوی کەماڵی بەدیهێنەری ئەم گەردوونە و حیکمەتی بەدیهێنانی ئەو بەدیهێنراوانە، ئەوەیە کە بە چەشنێك شارەزایی لەسەرئەو بەدیهێنراوانەی سەر گەردوون هەبێت کە فیترەتی ڕێنموونی لە دڵەکاندا بچێنێت و بەوجۆرەی خوای

گەورە دەیەوێت، وردەکاریی وایان پێ بگەیەنێت کە بەدیهێنراوەکان ڕێنموونی بکات بەرەو ناسینی ئەوەی بەدیهێناون و هێناونیەتە بوون.

**پێنجەم:** وا نارِوانرێت کە پەیوەندیەك هەبێت لەنێوان ئەو بەدیهێنراوە لاوازە بچووکانەی بەوپەڕی وردەکارییەوە هێنراونەتە بوون و بە تێروتەسەلی خولقێنراون، لەگەڵ بەدیهێنەری گەورەیاندا، مەگەر ئەوەی پەیوەندییەکە بریتی بێت لە پەیوەندی ملکەچی و سوپاس و ستایش و بەگەورەدانانی خوا، ئەمەش ئەو شتەیە کە خوای گەورە لە بەدیهێنراوەکانی دەوێت.

جا ئەگەر بوترێت (مەگەر خوا بێباك نیە لەوەی پێویستی بە خۆمان و پەرستنشمان هەبێت؟)

لە وەڵامدا دەڵێین: با، بەڵام هەرجۆرێك بێت، تۆ بێمنەت نیت لێی.

پرسیار: ئەمە پەیوەندی چیە بەوەوە؟

وەڵام: بەڵێ، خوا بەدیهێناویت و ڕۆزی دوایت، ژیانت بەدەستی ئەوەو ئەویش پێویستی بە تۆ نیە، بەڵام تۆ ئاتاجی بەو، پەرستشیش وەرگێڕانی ڕاستەقینەی سروشتیی ئەو پەیوەندییەیە، جا ئەگەر دەست بگریتەوە لە پەرستشی ئەو زاتە، واتە گوێت نەداوە بە چاکەکانی و بێباوەڕی و خۆبەزلزانیت لە بەرامبەریدا نیشان داوە.

خوای گەورە فەرمانی پێنەکردویت شتێك بکەیت کە ئەو پێویستی بێت، بەڵکو فەرمانی پێکردویت بەو شتەی کە پێویستە لە واقیعدا لە سروشتی پەیوەندی نێوان تۆ و خوادا هەبێت، ئەمە واتای فەرمایشتی خوا دەگەیەنێت کاتێك بێمنەتی خۆی لە هەموو جیهانیان نیشان دەدات، لە هەمان کاتیشدا هەواڵی ئەوەی داوە کە ڕازیی نیە بەندەکانی ڕێی کوفر بگرنەبەر.

یەکەمیان هەواڵدانە بە کەماڵی خوا لە بەرامبەر ناتەواویی تۆدا، دووەمیش هەواڵدانە بەوەی کەماڵی خوا و ناتەواویی تۆ، چی پێویستە؟ واتە بوونی تۆ بەستراوەتەوە بە بوونی خواوە، ئەگەر بتەوێت تەنها پشت بە خۆت ببەستیت، ئەوە پێچەوانەی مەنتیقی عەقڵ و پێویستی واقیع جووڵاویتەتەوە، دەی ئەو هەمووە

لادانەی لە ملەجیڕەیی و ملكەچنەكردنەوە نیشان دەدرێت، ئەوپەڕەكەی وەرگرتنی سزایەكی شایەن بەو لادانەیە، خۆ ئەگەر ئەوەش سزای لەسەر نەبوایە، ئەو هەڵوێستە ناشیرینترین دڵی بەرامبەر بە گەورەترین راستیەكانی بوون لەخۆدەگرت، ئەمەش گەورەترین ستەم بوو، بەڵام دادپەروەریی حەق بەوە رازی نیە، ئێستا لەم فەرمایشتەی خوا رابمێنە (وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ)، (ئەگەر حەق شوێن هەوا و ئارەزووی ئەوان بكەوتایە، ئەوا ئاسمانەكانی و زەوی و ئەوەش لەنێویاندایە هەمووی تێكئەچوو)، لەگەڵ واتای ئەم ئایەتە (أَفَمَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَنْ يُتَّبَعَ أَمَّنْ لَا يَهِدِّي إِلَّا أَنْ يُهْدَى)، (دەسا كەسێك كە بتوانێ رێبەریی هەق و ڕاستی بكات، شیاوترە پەیڕەوی بكرێت؟ یان ئەو كەسەی كە بۆ خۆیشی رێ نەزانێ، مەگەر رێی نیشان بدرێ؟ واتە ئەو بتانەی ئێوە كە ئێرە بۆ ئەوێ رێدەرناكەن، هێژاترن بۆ پەیڕەوی كردن، یان ئەو خوایە كە ئەو هەموو دەسەڵاتەی هەیە؟) هەروەها (مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ)، (ئێمە ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لەنێویاندایە بەدمان نەهێناوە ئیلا بە حەق نەبێت).

ئەگەر گوێی بیستن و شایەتیت هەبێت، حەق و راستیت روون دێتە پێش چاو.[١]

لە كۆتاییدا با لەم ئایەتانەی سوورەتی ئەنبیا رابمێنین (وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ، لَوْ أَرَدْنَا أَنْ نَتَّخِذَ لَهْوًا لَاتَّخَذْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا إِنْ كُنَّا فَاعِلِينَ، بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ، وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ عِنْدَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ، يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ، أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنْشِرُونَ، لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ، لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ)،[٢] (ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لەنێوانیاندایە، بێهوودە بەدیمان نەهێناوە بۆ گەمە و گاڵتە، ئەگەر بمانویستایە خێزان یان منداڵمان هەبێت ئەوە خۆمان دامانەنا،

---

(١) - ئەمە وتەی شێخ عەبدولا سەعید شەهرییە لە بابەتێكیدا كە لە پەڕەی خۆی لە فەیسبوك لە رێكەوتی ٧ ی نۆڤەمبەری ٢٠١٤ بڵاویكردبوویەوە.

(٢) - الأنبياء: ١٦-٢٣.

بەڵكو بە بەڵگەوە حەق روون دەکەینەوە و زاڵی دەکەین بەسەر باتڵدا و لەناوی ئەبات و تیائەچێت، هەڕەشەی سزای ڕۆژی دواییش بۆ ئێوە لەو وەسفە نارەوایانەی دەیاندەنە پاڵ خوا، هەرچیەك لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی بەتەنها موڵکی خوایە، ئەوانەیشی لەلای خوا گەورەن لە فریشتەکان، خۆیان بە گەورە نازانن لە ئاست پەرستنی خوای گەورەدا و ماندوو و بێزاریش نابن، بە شەو و رۆژ پەرستش و ستایشی پەروەردگار دەکەن و بێزار نابن، موشریکان لەسەر زەویدا خۆیان خوایان بۆ خۆیان بڕیارداوەو بڵاوی ئەکەنەوە، یاخود ئەوانن مردوو زیندوو ئەکەنەوە؟ ئەگەر لە ئاسمانەکان و زەویدا جگە لە زاتی الله خوای تری تێدابوایە، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی وێران دەبوون، پاك و بێگەردی بۆ الله کە پەروەردگاری عەرشی گەورەیە لەو وەسفە خراپانەی کە ئەیدەنە پاڵ خوای گەورە، خوای گەورە پرسیاری لێ ناکرێت لە هەرچیەك بیکات، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لێ ئەکرێت لەو کردەوانەی دەیکەن).

لەو سەرچاوانەی لەمبارەوە نووسراون، بریتیە لە کتێبی (لماذا یطلب الله من البشر عبادته) لە نووسینی دکتۆر سامی عامری کە ناوەندی تەکوین بە چاپی گەیاندووە.

## پرسیاری دووەم: بۆچی لە جیهاندا خراپە هەیە؟

ئەوانەی ئەم رەخنە دەگرن و کێشەیان بۆ دروست بووە، مەسەلەکەیان ئەوەیە کە ناتوانن بوونی خراپە و میهرەبانیی خوا پێکەوە بگونجێنن، ئەوان لەو بازنەیەدا تەنها میهرەبانی خوایان بیرە و سیفەتەکانی تری حیکمەت و عیززەت و گەورەییان لەیادکردووە.

ئەم پرسیارە لە روانگەی فەلسەفی و شەرعیشەوە مشتومڕێکی زۆری لەخۆگرتووە و توێژینەوەی زۆریشی لەسەر کراوە، منیش چەند بنەمایەکی کورت دەخەمەڕوو کە دەکرێت بەهۆیەوە لە مەسەلەی خراپە تێبگەین، پێش ئەوە با پرسیارێك لە کەسی مولحید بکەین و پێی بڵێین:

کاتێك بێباوەڕ بوویت بەرامبەر بە خوا، ئیتر خراپە لە جیهاندا کۆتایی پێ هات؟ ئایا قەسابخانەکان وەستان؟ ئایا لافاو و بورکانەکان دامرکانەوەو بومەلەرزەکان نەمان؟

پاشان، پێمان بڵێ، ئەو سەرکەشە تاوانبارە بکوژانەی کە خوێنی هەزاران، یان ملیۆنەها کەسیان ڕشت، ئایا دوای مردنیان سزا دەدرێن؟ ئایا مافی ستەملێکراوانیان لێ وەردەگیرێتەوە؟

گرفتە ڕاستەقینەکە -لە پرسیارکردن سەبارەت بە خراپە- بەرەوڕووی مولحید و نائایینیەکان دەبێتەوە، ئەوانەی کە نکوولّی دەکەن لە بوونی ڕۆژی دوایی، نەوەك باوەڕدارێك کە باوەڕی هێناوە بە پاداشت و سزا.

باوەڕدار لە چەند بنەمایەکی یەکانگیر و دیدێکی بنیادنەرانەی پتەوەوە دەڕوانێتە مەسەلەی خراپە، نەوەك تەنها سۆزدارییەکی بێ بەڵگە، دیدی موسڵمانیش لەماندەدا خۆی دەبینێتەوە:

**یەکەم:** خوای گەورە ویستێکی ئازادنەی داوە بە مرۆڤ هەتا لەنێوا چاکە و خراپەدا خۆی یەکێکیان هەڵبژێرێت، ئەمەش ئەوپەڕی دادپەروەرییە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەسەر ویستی خۆی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت، کاتێك مرۆڤ بە ویستی خۆی شتێك هەڵدەبژێرێت، ئەوەی پێ باشە کەسێك بکوژێت، یان خوێنێك بڕژێت، ئەوکاتە خراپەکە دەدرێتەوە پاڵ ئەو کەسەی خراپەکەی هەڵبژاردووە، نەك بدرێتەوە پاڵ خوا.

**دووەم:** ناتوانین لە حیکمەتی بوونی خراپە تێبگەین هەتا باوەڕ نەهێنین بەوەی ئەم دنیا شوێنی کەموکورتی و تاقیکردنەوەیە، نەوەك شوێنی پاداشت، ئەو خراپەی لەم دنیایەدا دەیبینین، چ لە چەرمەسەری و نارەحەتی و کارەسات و نەخۆشی، هەمووی دەچێتە نێو بازنەی ئەو وەسفە گشتیەی کە خوای گەورە ویستوویەتی دنیای لەسەر بێت، هەرکەس لەم دنیایەدا بەدوای پاداشت و سزادا بگەڕێت، پاشان ئەگەر ئەوانەی بەدینەکرد، خوا تۆمەتبار بکات، پێی دەڵێین: تۆ لە مەبەستی خوا لەم ژیانەدا تێنەگەیشتویت.

**سێیەم:** لەو سوننەتانەی کە خوای گەورە دایناون، بریتیە لە سوننەتی تاقیکردنەوەو تووشبوون، هیچکاتی نابینیت سوننەتی خوا بگۆڕێت، ئەمەش تەبا و گونجاوە لەگەڵ واتای صیفەتی حیکمەتی خوادا، ئەو تاقیکردنەوانە کە موسڵمان وەك زێڕی پوخت لێی دەردەچێت پاش ئەوەی بە ئاگر تاقی دەکرێتەوە، ئەمە زۆربەی خەڵك وا لێدەکات بگەڕێنەوە لای پەروەردگاریان و لە تاوان پاکیان دەکاتەوە، ئەمانە هۆکارن بۆ دەربازبوونی زۆرکەس لە دۆزەخ.

**چوارەم:** هەندێ دیوی حیکمەت هەیە کە ئێمە بە خراپە لێی تێدەگەین و دەکرێت زۆرجار لە روانینی یەکەمدا بۆمان روون نەبێتەوە.

نموونە: کاتێك خزر بەلەمەکەی کونکرد، مووسا حیکمەتی ئەوەی بۆ روون نەبوویەوەو لەوپەڕی نارەزایەتیدا پێی فەرموو (أخرقتها لتغرق أهلها) کونت کرد بۆ ئەوەی ئەوانەی تیایدان بخنکێن؟ پاشان کاتێك هۆکارەکەی زانی، بۆی دەرکەوت ئەو کارە زۆر باش بووە، ئەو بەلەمە هی کۆمەڵێك هەژار بوو کە لە دەریادا کاریان دەکرد، پاشای ستەمکاری ئەوکاتیش، هەر کەشتیەکی باشی بەدیبکردایە دەیبرد، خزریش ویستی عەیب و کەلەبەرێکی بچووکی بۆ دروست بکات هەتا بمێنێتەوە بۆ هەژارەکان، ئەوە باشترە لەوەی بەلەمەکە بە چاکی بمێنێتەوەو ببرێت بۆ پادشا ستەمکارەکە.

لە واقیعی ژیانیشماندا زۆر شتمان بەسەردا تێدەپەڕێت کە زۆر سوورین لەسەر بەدەستهێنانیان، پێمان وایە ئەمانە ئەوپەڕی خۆشی و بەختەوەرین، دواتر کە روودەدەن، دەردەکەوێت وانیە و ئاوات بەوە دەخوازین بریا روویاننەدایە، چەند کەس هەبووە ئاواتی بە منداڵ خواستووە، کەچی کە دواتر پێی بەخشراوە، بووە بە هۆکاری نارەحەتی و سەرکەشبوونی لەم ژیانەدا هەتا وای لێهاتووە ئاواتی بە وەجاخ کوێری خواستووە، بۆیە مەزندەی یەکەمی ئێمە بۆ چاکە و خراپە، مەزندەیەکی راستەقینەی رەها نیە.

خوای گەورە خراپەیەکی بەدینەهێناوە کە سەراپای خراپە بێت، لەوانەیە ئەوەی لە سەرەتاوە بە خراپە دەیبینین، ئەگەر لە هەموو روانگەکانەوە لێی وردبینەوە،

چاکەشی تێدا بەدیبکەین، بەڵام نەوەك بەو مەرجەی هەر لەم ژیانەدا چاکەکەیمان بۆ دەربکەوێت، لەوانەیە ئەو چاکەیە دواخرابێت بۆ رۆژی دوایی.

لەو سەرچاوە گرنگانەی لەم بوارەدا نووسراون، بریتیە لە کتێبی (مشكلة الشر و وجود الله) لە نووسینی دکتۆر سامی عامری.

## پرسیاری سێیەم: بۆچی خوای گەورە نزای هەندێ کەس گیرا ناکات؟

**یەکەم:** خوای گەورە تاقیکردنەوە بە خەڵك دەکات، بەڵام خوا ناخرێتە بەر تاقیکردنەوە، جا ئەو کەسەی بۆ تاقیکردنەوەی خوا، داوا لە خوا دەکات، لە فەرمانی خوا لایداوە، ئیتر چۆن نزاکەی وەڵام بدرێتەوە؟

**دووەم:** خوای گەورە نزای زۆربەی خەڵکی وەڵام داوەتەوە، ئەمەشمان لە خۆمان و دەوروبەرماندا بەرچاوکەوتووە، جا پرسیارە دروستەکە ئەمەیە: ئەو بەربەستە چیە کە لە پێناویدا وەڵامدانەوەی نزاکانمان دواخراوە؟

ئەمە وامان لێدەکات، بەخۆداچوونەوە بکەین و بەدوای هەڵە شاراوەکانماندا بگەڕێین و خۆمان چاك بکەین و هەوڵی زیاتر بدەین بۆ نزیکبوونەوە لە خوا و لەوەش دڵنیا بین کە هەرچیەك خوای گەورە بۆی دانابین، زۆر باشترە لەوەی بۆ خۆمان بەتەمای هەین.

**سێیەم:** برێك بەڵگەی عەقڵیی یەکلاکەرەوەمان هەن کە بەڵگەی ئەوەن پێویستە بەدیهێنەرێك هەبێت، هەروەها بەڵگەن بۆ کەماڵی حیکمەت و زانستی خوا، جا کاتێك لای هەندێك کەس بابەتی وەڵامنەدانەوەی نزا لەگەڵ ئەو بەڵگە یەکلاکەرەوانەدا تەبا نابن، پێویستیی عەقڵیی وادەخوازێت کەسە ژیرەکان بەڵگەی بەهێزتر پێش بخەن و لەسەر بنەمای دەقی روون لەوی دی تێبگەن، ئەمەش پرسێکی سەرەتایی وجوودیی جێگیرە.[1]

---

(١) - ئەم خاڵە لە وەڵامێکی مامۆستای هاوڕێم سولتان عومێرییەوە وەرگیراوە.

**چوارەم:** بەدوای لایەنەكانی حیكمەتی دواكەوتنی وەڵامدانەوەی نزاكانماندا بگەڕێین، چونكە سنووردارییی زانستی مرۆڤ وادەكات دید و هیواكانیشی سنووردار بن، چەند نزامان هەبووەو گیرا نەبون، دواتر دیوی چاكەی گیرانەبوونەكەمان بۆ دەركەوتووە.

**پێنجەم:** پێشەوا ئیبنولقەییم رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (نزا و ئەو نزایانەی پەنایان پێ دەگرین بە خوا، وەك چەك وان، چەكیش بەپێی بەكارهێنەرەكەیەتی نەوەك بەپێی تیژیەكەی، هەركات چەكەكە چەكێكی تەواو و بێ ئافەت و بازووش بازوویەكی بەهێز بوو و بەربەستیش لەبەردەمیدا نەبوو، ئەوە تێسرەواندنی دوژمنی لێدەكەوێتەوە، هەركاتیش یەكێك لەو سیانە بوونیان نەبوو، كاریگەرییەكە كەم دەكات).[1]

**شەشەم:** پێویستە هەموو دەقەكانی ئەو بابەتە تەماشا بكەین، نەوەك بەش بەشیان بكەین، ئەو خوایەی دەفەرمویێت (ادعوني أستجب لكم) (داوام لێ بكەن، وەڵامتان دەدەمەوە)، هەر ئەو خوایە دەفەرمویێت (ولنبلونكم) (بەدڵنیاییەوە تاقیتان دەكەمەوە)، جا هەركەس بیەوێت بە نزا كۆتایی بهێنێت بە سوننەتی تاقیكردنەوەی مرۆڤ، وەك ئەوە وایە بەشێكی دەقەكەی وەرگرتبێت و دەستی لە بەشەكەی دی هەڵگرتبێت، هەروەها لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە (يستجاب لأحدكم ما لم يعجل)، (نزای هەركامتان گیرا دەبێت، بەو مەرجەی پەلە نەكات)، ئەمە دەقێكە كە مەرجێكی گرنگی گیرابوونی نزامان بۆ روونده‌كاتەوە، ئەویش پەلەنەكردنە.

بەڵام مولحیدان كە نكوڵیی بوونی خوا دەكەن بەو بانگەشەی گوایە وەڵامی نزا ناداتەوە، ئەوە پێیان دەڵێین وادابنێن خوای گەورە وەڵامی نزا ناداتەوە، دەی ئەمە كەی بەڵگەی نەبوونی خوایە!

---

(١) - الداء والدواء، ص ٢٧.

## پرســـیاری چـــوارەم: چـــۆن قـــەزاو قەدەر و سزادانی بێباوەڕ لەسەر بێباوەڕییەکەی پێکەوە بگونجێنین؟

بابەتی قەزا و قەدەر، یەکێکە لەو بابەتە بیستراوە شەرعیانەی کە راستیەکەی لە خودی شەرعەوە دەزانرێت و عەقڵیش لەم بابەتەدا لەو روانگەوە بەشداریی پێ دەکرێت کە لە واقیعدا مرۆڤ سەرپشکە لە بڕیاردانەکانی سەرجەم کاروباری ژیانیدا، زۆرجار تێکەڵکردن و لێتێکچوون لەم بابەتەدا لەوەدا روودەدات کە واتای قەدەر و پابەندبوونی بێدەسەڵاتیی (جەبر) تێکەڵ دەکرێت، ئەمەش دروست نیە، چونکە خوای گەورە کردار و ویستی بۆ بەندە بڕیارداوە، ویستێك کە لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، ئەگەر ئەم ویستە راستەقینە نەبێت، ئەوکات ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی کتێبەکان هیچ سوودێکی نەبووە، چونکە پێغەمبەران بۆ ئەوە نێردراون کە وەبیرهێنانەوەی خەڵك بکەن، جا هەرکەس بەدەمیانەوە هاتبێت، پاداشت وەردەگرێت، هەرکەسیش پشتی تێکردبن، سزا دەدرێت، جا ئەگەر مرۆڤایەتی ویستی پێ نەدرابێت هەتا کار بکرێت بە وەبیرهێنانەوەو پاداشت و سزا، ئەوکات ئیشەکە هەوانتەییەکی پێوە دیارە، خوای گەورەش بەدوورە لەوە.

لە هەمان کاتدا، ویستی مرۆیی لە سوننەتی ئەو هۆکارانەیە کە خوای گەورە لەم گەردوونەدا دایناوە، خوای گەورە خۆی خاوەن ویست و بڕیارە بۆ ئەو هۆکارانە، جا وەك چۆن بۆ منداڵبوون هاوسەرگیری کردووە بە هۆکار، بۆ سووتان ئاگر و بۆ شکانی تینوێتی ئاوی کردووە بە هۆکار، بە هەمان شێوەش ویستی کردووە بە هۆکارێك بۆ بووژانەوەی کردار، کرداریشی کردووە بە هۆکار بۆ چوونە ناو بەهەشت یان دۆزەخ، هەموو ئەو هۆکارانە بەدەر نین لە ویستی خوا، بەڵکو لەژێر ویست و بڕیاری خوادان، ئەگەر بیەوێت شوێنەواریان لەکاردەخات، وەك چۆن بۆ ئاگرەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر کردی.

بابەتی قەدەر، پەیوەستە بە حیکمەتی خواییەوە، حیکمەتی خواییش مرۆڤ ناتوانێت هەمووی بزانێت، بۆیە لە عەلیەوە (رەزای خوای لێ بێت) هاتووە دەڵێت (قەدەر نهێنیەکە لە نهێنیەکانی خوا)، بۆیە مەنهەجیەتی دروست لە هەڵوێست نواندن لە قەدەردا بەوە دەبێت خۆت بدەیت بەدەست هەر زانیاریەك سەبارەت بە

قەزا و قەدەری خوا و سەرپشككردنی مرۆڤ و سەلماندنی ویست و سەرپشكیی مرۆڤ هاتووە، ئەم خۆبەدەستەوەدانە لەسەر پێشەكی بڕوابوون بە خوا وەستاوە، ئەم ئیمانە بە بەڵگەی یەكلاكەرەوەی عەقڵیی چەسپاوە، خۆبەدەستەوەدان لێرەدا لەسەر بەڵگەكانی عەقڵ دامەزراوە، خوای گەورەش زاناترە.

لەو سەرچاوانەی لەم بارەوە نووسراون، بریتیە لە كتێبی (شفاء العليل في القضاء و القدر و الحكمة والتعليل) لە نووسینی ئیبنولقەییم ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

## بەشی دووەم: گومانەكان سەبارەت بە قورئانی پیرۆز

ئەمەش دابەش دەبێت بۆ دوو لق:

### لقی یەكەم: گومانخستنە سەر دروستیی ئەوەی فەرموودەكان بدرێنەوە پاڵ خودا:

لەبەرئەوەی پەیوەندیی و یەكانگیریی هەیە لەنێوان بەڵگەكانی پێغەمبەرایەتی و بەڵگەكانی دروستیی قورئان، بۆیە قسەكردن لەسەر بەڵگەكانی دروستیی قورئان دەگێڕمەوە بۆ بەشی دواتر لە كاتی باسكردنی بەڵگەكانی پێغەمبەرایەتیدا.

### لقی دووەم: بانگەشەی بوونی هەڵە لە فەرموودەكاندا:

ئەو هەڵانەی بانگەشەیان بۆ دەكرێت سێ جۆرن(زمانەوانی، زانستی (سروشتی) و دووفاقی نێوان ئایەتەكان).

### جۆری یەكەم: هەڵە زمانەوانییەكان (هەڵەی نەحوی):

لە چوار لاوە باسی وەڵامدانەوەی هەموو ئەو هەڵە نەحوییانە دەكەم كە گوایە لە قورئاندا هەن:

**یەكەم:** ئەوپەڕی ئەوەی گومانگەراكان دەیانەوێت بیلێن ئەوەیە كە قورئان دانراو و داهێنانی موحەممەدە ﷺ نەوەك لای خواوە بێت، چونكە ئەگەر لای خواوە

بێت، هەرگیز هەڵەی نەحویی تێدا نابێت، ئێمەش پێیان دەڵێین: تەنانەت ئەگەر قورئانیش وابێت، -دوور لە شتی وا- هەر ناکرێت هەڵەی نەحویی تێدابێت، چونکە زمانی قورەیش لەو کاتەدا لەنێو زمانی عەرەبیدا بەڵگە بووە، ئیتر ئایا قسەکەرەکە موحەممەد بێت یان عوتبەی کوڕی رەبیعە بێت، یاخود وەلیدی کوڕی موغیرە، جا ئەگەر دەقێکی پارێزراوی ئەبووجەهلمان لەبەردەست بوایە، هەر نەدەکرا بڵێین هەڵەی نەحویی تێدایە!

**دووەم:** بنەماکانی نەحو لەدوای قورئانەوە دانراون نەوەك لە پێش ئەوەوە، دانانەکەشی وەرگیراوی گوتاری عەرەبیی پارێزراوی ئەو قۆناغە و پێشتر بووە، بنەماکانی نەحو لە قورئان و شیعری سەردەمی نەفامی و دەقی عەرەب و زمانی تۆمارکراوی ئەو قۆناغەیانەوە دانراون، نەحوییەکانیش بۆ بنەماکانی نەحو، دەقی قورئان و شیعر بە بەڵگە دەهێننەوە، نەك بە پێچەوانەوە.

**سێیەم:** هۆزەکانی عەرەب شێوەزاری خۆیان هەیە کە لە رووی بنەمای ئیعرابییەوە جیاوازییەك لەنێوانیاندا هەیە، نەحویەکان بە (لغات) زمانەکان ناویان دەبەن، واش مامەڵەیان لەگەڵ هیچکامیاندا نەکردووە کە هەڵە بێت، بەڵکو بە دیوە جیاوازەکانی ناو زمانی عەرەبییان داناوە، بۆیە دەبینین هەندێ هۆزی عەرەب موثەننای ئەلف دەچەسپێنن بەسەر هەموو حاڵەتەکاندا، چ رەفع و نەصب و چ جەڕ، ئیبن عەقیل لە شەرحی ئەلفییەی ئیبن مالیك لە نەحودا دەڵێت (ئەوەی کە دانەر باسی دەکات گوایە موثەننا و مولحەقەکەی بە ئەلفی رەفع و یائی نەصب و جەڕ دەبن، ئەمە لەناو زمانی عەرەبدا بڵاوە، هەندێ لە عەرەبەکانیش موثەننا و مولحەقەکەی بە ئەلفی موتلەق (رەفع و نەصب و جەر) دادەنێن، بۆیە دەڵێن: جاء الزيدان كلاهما و رأيت الزيدان كلاهما و و مررت بالزيدان كلاهما).[١]

زانای پایەبەرز موحەممەد موحیەدین عەبدولحەمید لە (منحة الجليل بتحقيق شرح ابن عقيل) دەڵێت: (ئەوە زمانی کینانە و بەنی حارسی کوڕی کەعب و بەنیلعەنبەر و بەنی هجیم و چەند تیرەیەکی رەبیعە بەکر بن وائیل و

---

(١) - ١/58.

زوبەید و خەسعەم و هەمدان و عزرەیە، لەسەر ئەوەش فەرمایشتی خوا هاتووە (إن هذان لسحران) پێغەمبەری خوایش ﷺ دەفەرمویت (لا وتران في ليلة)، قسەی شاعیریش لەو بارەوە هاتووە:

تزود منا بين أذناه طعنة دعته إلى هابي التراب عقيم

ئەگەر زمانی باوی عەرەب وەربگرین بۆ (هذان) و (وتران) و (أذناه)، دەبوو بە یاء بێت، چونکە یەکەمیان ئیسمی (ان) و دووەم ئیسمی (لا) ن کە هەردووکیان مەنصووبن، سێیەمیش لە شوێنی مەجرووره لەبەر ئەو زەرفەی لەپێشیەوە هاتووە.

لە ئایەتەکەشدا چەند تەخریجێکی تر هەن کە لەو شوێنەدا باسکراون، باشترە بگەڕێیتەوە سەر سەرچاوەکە.

پێشەوای ناوداری زمانەوانی، ئەحمەدی کوڕی فارس کە لە ساڵی ٣٩٥ ی کۆچی وەفاتی کردووە، لە کتێبەکەیدا (الصاحبي في فقه اللغه) دا دەڵێت:

(بەشی باسی جیاوازی زمانەکانی عەرەب:

جیاوازی زمانەکانی عەرەب لە چەند روویەکەوەیە:

یەکەمیان جیاوازییە لە حەرەکاتدا، وەك (نَستعين) و (نِستعين)، لای قورەیش بە فەتحە و لای ئەسەد و چەندێکی تریش بە کەسری نوونە.

دووەمیشیان جیاوازییە لە حەرەکە و سکووندا، وەك (معَكم) و (معْكم).

ئینجا باسی چەند جۆر جیاوازی دەکات، هەتا دەڵێت: هەیانە لە ئیعرابدا رای جیاوازی هەیە، وەك (ما زيدٌ قائماً) و (ما زيدٌ قائم) و (إن هذين) و (إن هذان)، بە ئەلف زمانی بەنی حارسی کوڕی کەعبە کە بۆ هەر یائێکی ساکین کە پێشەکەی فەتحە بێت، وا دەڵێن، ئەم شیعرەشیان هەیە:

تزود منا بين أذناه ضربةً دعته الى هابي التراب عقيم).[1]

---

(١) - ص ٢٥ و ٢٦.

چوارەم: ئەوانەی دەوترێن گوایە هەڵەی ناو قورئانن، لە ئاسانترین بەشەکانی ناو زمانی عەرەبین، بۆ کێ هەیە نەزانێت ئیسمی (إنّ) مەنصووبە؟ کێ هەیە نەزانێت مەعتووفی سەر مەنصووب مەعتووفە؟ ئەمە شتێکە منداڵێکیش کە وانەی عەرەبی دەخوێنێت دەیزانێت، ئایا عەقڵ قبووڵی دەکات کتێبێك کە ئەو هەموو وردەکاری و روونکردنەوەو ئەو رەوانبێژیە بەهێزەی تێدایە، هەڵەیەکی وا ساکار و سادەی تێکەوتبێت؟ بێگومان قسەی وا، سنووری هەمو مەعقوولێکی تێپەڕاندووە.

بۆ نموونە ئەوانەی تانە لە قورئان دەدەن، دەڵێن: قورئان هەڵەیەکی تێدایە لە سوورەتی مائیدەدا، رەفعێکی تێدایە کە حەق وایە نەصب بێت، ئەمەش لە فەرمایشتی خوادا (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَى)، جا کە (صابئون) بە رەفع هاتووە، دەیکەن بە کێشە لەبەرئەوەی مەعتووفی سەر مەنصووبە کە ئەویش ئسمی (إن) یە، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانەیان دەڵێین: لە قورئاندا دوو ئایەتی هاوشێوەی ئەم ئایەتە هاتون کە تیایدا بە نەصب هاتووە (الصابئين) کە ئێوە دەڵێن ئەوە راستە، ئەمەش لە سوورەتی بەقەرە (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ) هەروەها لە سوورەتی حەج (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ)، بۆیە بابەتەکە لە نەزانیەوە نیە وەك ئەوەی ئێوە بیری لێ دەکەنەوە.

پێشەوا ئیبن عاشوور رەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیرە گەورەکەیدا (التحرير و التنوير) دەڵێت:

جمهووری راڤەکارانی قورئان فەرمایشتی (والصابئون) بە موبتەدەء دادەنێن و بە موقەدەمی تەئخیری دەزانن و خەبەرێکی حەزفکراوی بۆ دادەنێن لەبەر واتای خەبەری (إن)، ئەسڵی نەزمەکەش ئەمەیە: إن الذين آمنوا والذين هادوا والنصارى لهم أجرهم ... إلخ و الصابئون كذلك، وەك وتەی ضابی کوڕی حارس تەماشای دەکەن:

فإني وقيار بها لغريب.[1]

---

(١) - (٦/٢٧٠-٢٧١)

## جۆری دووەم: هەڵەی زانستیی:

لەو گومانانەی دەورووژێنرێن، دەڵێن: قورئانی پیرۆز چەند ئایەتێکی تێدایە پێچەوانەی دۆزینەوە زانستیە سروشتیەکان، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە قورئان لای خواوە نیە، چونکە ئەگەر لای خواوە بوایە، هەرگیز ئەو جۆرە هەڵانەی تێدا نەدەبوو.

بەڵگەشیان بۆ ئەوە فەرمایشتی خوایە سەبارەت بە زولقەرنەین ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِنْدَهَا قَوْمًا﴾،[١] (تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە خۆری لێ ئاوا دەبێت، ئەوپەڕی زەوی لە خۆرئاواوە کە هیچ شتێکی تر نەما تەنها دەریا نەبێت، وای بینی کە خۆر ئاوا دەبێ لە شوێنێك وەکو قوڕ لەبەرچاوی ئەم وەکو قوڕێکی ڕەش وایە، وە گەرمە چونکە لە تیشکی خۆرەوە نزیکە، لەوێ لای خۆرئاوا قەومێکی بینی).

جا دەڵێن: چۆن خۆر لەناو شتێکی وادا ئاوا دەبێت، لەکاتێکدا بەهۆی زانستەکانی سەردەمەوە ئەوە دەزانین کە خۆر زۆر لە زەوی گەورەترە و زۆریش لە زەوییەوە دوورە و ڕێڕەوێکیشی نیە بیگەیەنێت بە زەوی چ جای ئەوەی بچێتە ناویەوە.

ئەم گومانە هەرچەندە خۆی لە خۆیدا زۆر لاواز و بێمانایە، کەچی کاریگەریی لەسەرهەندێ گەنج دروست کردووەو مولحید و مەسیحیە عەرەبەکانیش بازاڕ گەرمییان بۆ کردووە.

وەڵامی ئەم گومانە لە چەند ڕوویەکەوە:

**یەکەم:** خوای گەورە هەواڵی ئەوەی نەداوە خۆر لەناو (عین حمئە) دا ئاوا دەبێت، بەڵکو خوای گەورە وەسفی بینینی زولقەرنەینی کردووەو دەفەرموێت (وجدها تغرب)، واتە لە بینین و تەماشاکردنی زولقەرنەیندا، وەك چۆن دەڵێین: مانگ لە پشتی شاخەکەوە هەڵهات، لەراستیدا مانگ لە دەرەوەی زەویە و لێیەوە دوورە، بەڵام لە تەماشاکردنی ئێمەوە وا دەردەکەوێت کە لە پشت شاخەکانەوە هەڵدێت یان ئاوا دەبێت.

---

(١) - الکهف: ٨٦.

**دووەم:** زۆرێك لە زانایانی پێشووی تەفسیر و پێش دەرکەوتنی مانگە دەستکردەکان و تەلەسکۆبە نوێکانی سەردەم، ئەوەیان روونکردۆتەوە کە مەبەست بەم ئایەتە ئەوەیە کە لە روانینی تەماشاکەرەوە وادەردەکەوێت، نەوەك راستیی مەسەلەکە وابێت، لەوانەش: ئیبن کەسیر کە لە ساڵی ٧٧٤ ی کۆچی وەفاتی کردووە، ئەم زانایە رەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: واتە خۆری بینیوە لە دیمەنی کاتی ئاوابوونی لە دەریای ئەتلەسی، ئەمەش بۆ هەرچیەك وایە کە لە کەناراوەکەیەوە تەماشا بکرێت کەسەکە وادەزانێت لەناو دەریاکەدا ئاوا دەبێت، لەکاتێکدا مانگ لەو خولگە چوارەمە جیانابێتەوە کە تیایدا جێگیرە.[١]

قورتوبی لە تەفسیرەکەیدا بەم چەشنە وتەی هەندێ لە زانایان دەهێنێت (قەففال دەڵێت: هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەست پێی ئەوە نیە کە خۆرئاوابوون و خۆرهەڵاتنی خۆر واتای گەیشتن بێت بە خودی خۆر و دەست پێ گەیشتنی، چونکە لەگەڵ ئاسماندا بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە بێ ئەوەی بنووسێت بە زەویەوە، خۆر زۆر لەوە گەورەترە بچێتە نێو کانیاوێکی (دەریایەکی) زەوییەوە، بەڵکو چەند بەرامبەر لە زەوی گەورەترە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە لە بەری رۆژئاوا و رۆژهەڵاتەوە -بە روانین- گەیشتۆتە کۆتای ئاوەدانی، بۆیە بە تێڕوانینی چاو وای بینیوە لەناو (عین حمئە) دا ئاوا دەبێت، وەك چۆن ئێمە کاتێك لە زەویەکی رووتەندا دەیبینین، دەڵێیت دەچێتە ناو زەوی).[٢]

بەیزاوی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت (لەوانەیە گەیشتبێتە کەناراوی موحیت و ئەویش وای بینیبێت، چونکە هەتا چاوی بڕی کردووە تەنها ئاوی بینیوە، بۆیە دەفەرموێت (وجدها تغرب)، و نەیفەرمووە (کانت تغرب)).

لە تەفسیری جەلالەینیشدا هاتووە (ئاوابوونی لە عەیندا لە روانینی چاودا بووە، ئەگەرنا خۆر زۆر گەورەترە لە دنیا).

---

(١) - (٥/ ٥١١).

(٢) - (١٣/ ٣٧٠).

ASTANA

بەو چەشنە وەك دەبینیت، هەر لە دێرزەمانەوە بابەتەكە زۆر روون و بێ پەردە بووە.

لەو دەقە قورئانیانەی تر كە ئەوان بانگەشەی ئەوە دەكەن لەگەڵ زانستی نوێدا ناگونجێت، فەرمایشتی (وهو الذي مد الأرض) دەڵێن: ئەمە لەگەڵ دۆزینەوەی نوێی زانستدا ناگونجێت كە دەیسەلمێنێت زەوی خڕە، لەراستیدا ئەمەش نەفامیەكی گەورەیە، چونكە خڕێتی زەوی هەر لە دێرزەمانەوە شتێكی زانراو بووە و زانایانی موسڵمانیش ئیجماعیان لەسەرهێناوە، ئیبن حەزم رەحمەتی خوای لێ بێت باس لەوە دەكات (یەك كەس لە پێشەوایانی موسڵمان كە شایەنی ئەوە بێت لە زانستدا پێی بوترێت پێشەوا، نكوڵیی نەكردووە لە تەكویر[1]ی زەوی، شتێكیش نەهاتووە كەسیان یەك قسەی تێدا كردبێت، بەڵكو بەڵگەكانی قورئان و سوننەت لەسەر تەكویری زەوی هاتون).

ئەو بانگەشە كە بڵێت لەگەڵ ئایەتەكەدا ناگونجێت، ئەوە چەند سەدە لەمەوبەر وەڵامی دراوەتەوەو رازی لە (التفسير الكبير) دا دەڵێت: ئەگەر بڵێن فەرمایشتی خوا (مد الأرض) پێچەوانەی ئەوەیە زەوی گۆیی بێت، دەڵێین، خۆبەدەستەوە نادەین، چونكە زەوی جەستەیەكی گەورەیە و گۆییش ئەگەر لەوپەڕی گەورەییدا بێت، هەر پارچەیەكی كە دەبینرێت، وەك تەختایی دەبینرێت).[2]

### جۆری سێیەم: بانگەشەی بوونی هەڵە لە قورئاندا لەبەرئەوەی هەندێ ئایەت ناگونجێن لەگەڵ هەندێكی تریاندا:

یەكێك لەو تانانەی كە مولحیدان و گومانگەراكان لێی دێنەژوورەوە بۆ لێدان لە ئیسلام، بانگەشەی بوونی دووفاقییە لەنێوان ئایەتەكاندا، واتە ئایەتەكان دژ بە یەك بن، ئەمەش كەموكورتی دەگەیەنێت، كەواتە قورئان لای خوایەكی كامڵەوە نەهاتووە!

---

(١) - بۆیە خودی دەستەواژەی تەكویرم هێنا، چونكە هەندێك بە واتای خڕێتی لێكی نادەنەوە. وەرگێڕ.

(٢) - مفاتيح الغيب (٤/١٩).

ئەم قسەیە لەسەر پێشەکیەکی خراپ دامەزراوە، ئەویش ئەوەیە کە لە قورئاندا بڕێك ئایەتی ناتەبا بە یەك هەن، ئەم قسەش نادروستە، هەموو ئەو نموونانەش کە دەیانهێننەوە، زۆر بە دیار و روونی دەدرێتەوە بەڕوویاندا.

سەرچاوەی رووکەشی ئەم بانگەشەیە، نەزانییە بەرامبەر واتای دەربڕینەکانی زمانی عەرەبی لەنێوان واتای گشتی و واتای تایبەت و ئەو گشتیەی کە مەبەست پێی تایبەتە، نەشارەزاییە بەرامبەر کۆی ئەو دەقانەی لە قورئان و سوننەتدا لەبارەی یەك بابەتەوە هاتون، چونکە هەندێکیان واتای ئەوانی دیکە روون دەکەنەوە.

زانایانی تەفسیر گرنگییان داوە بە روونکردنەوەی فەرمایشتی ناو ئایەتەکان، ئەو وشانەی کە بە رووکەش واتاکەیان نەگونجان و ناتەبایی نیشان دەدات، جا هەرکات بیستت بانگەشەی ئەوە دەکرێت دەقی ئایەتێك لەگەڵ دەقێکی تردا ناگونجێت، خێرا بگەڕێرەوە سەر کتێبەکانی تەفسیری قورئان، لەوێ وەڵامت دەستدەکەوێت، بەڵکو لەنێو زانایاندا کەسی وا هەیە کتێبێکی تایبەت کردووە بەو بوارە، لە دیارترینیان پێشەوا موحەممەد ئەمین شنقیتی لە کتێبەکەیدا (دفع إيهام الإضطراب عن آي الكتاب).

نموونەی ئەو ئایەتانەی کە بانگەشەی ئەوە دەکرێت لەگەڵ یەکدا ناگونجێن و لەسەر زمانی گەنجێکی مولحیدی میصری بیستم کە بە ئاشکرا دژ بە ئیسلام، ئیلحادی خۆی نیشان دەدا و لە رێی راگەیاندنەوە بەرگریی دەکرد لە بیرە ئیلحادییەکەی، زۆر خەفەتم خوارد ئەو جۆرە نموونانە ببنە بەڵگە بەدەست ئەوانەوە کە وازیان لە ئیسلام هێناوە، بەڵام هەرکەس خوای گەورە بیەوێت تاقی بکاتەوە، لای خوا هیچت بۆ ناکرێت بۆی.

نموونە: دەڵێت: ئەم ئایەتە (وَإِنْ تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِكَ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ)،[١] (ئەگەر تووشی چاکەیەك ببوونایە لە رزق و رۆزی و بەروبووم، ئەیانوت: ئەمە لەلایەن خوای گەورەوەیە، ئەگەریش تووشی بەڵاو موسیبەتێك ببوونایە، ئەیانوت: ئەی موحەممەد ئەمە بە

---

(١) - النساء: ٧٨.

هۆی تۆوە بووە، پێیان بڵێ: هەموو شتێك لەلایەن خوای گەورەوەیە) ناگونجێت لەگەڵ ئەم ئایەتە (مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ)،[1](تووشی هەر چاكەیەك ببیت ئەوە لە خواوەیە، ئەگەریش تووشی هەر خراپەیەك ببیت، ئەوە بەهۆی تاوانی خۆتەوەیە) ئیتر چۆن لە ئایەتێكدا چاكە و خراپە لای خواوەیە، دواتر لە ئایەتێكی تردا خراپە لە خۆمانەوەیە؟

تانەدەران پێیان وایە ئەوە نەگونجان و دووفاقییەكی روونە، پەنابەخوا ئەگەر هیچ جۆرە دووفاقییەك لەو كتێبە روون و رەواندا هەبێت، ئەو بانگەشەش ئەوپەڕی سادەیی و بیركردنەوەی سەرپێییە، ستایش بۆ خوا كە دوای دوو ئایەتی تر لەو ئایەتە دەفەرموێت (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا)،[2] (ئایا بۆ بیر لەقورئان ناكەنەوەو لێی رانامێنن، خۆ ئەگەر قورئان لەلایەن جگە لە خواوە بهاتایە، ئەوە جیاوازی و دژبەیەكیەكی زۆریان لە قورئاندا بەدیدەكرد)، وەك بڵێیت خوای گەورە پێمان بفەرموێت: هیچ ناكۆكیی و نەگونجان و دووفاقیەك لەم كتێبەدا نیە.

سەبارەت بە لەیەكدانی ئەم دوو ئایەتە دەڵێین:

مەبەست بە ئایەتی یەكەم ئەوەیە كە بێباوەڕەكان خەریكی بڵاوكردنەوەی رەشبینی و نیشاندانی بەدبەختی بوون لەئاست پێغەمبەری خوا، ئەگەر وشكەساڵییەك روویتێكردنایە -كە مەبەست بە خراپە لە ئایەتەكەدا ئەمەیە- ئەوە دەیاندایەوە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و دەیانوت شوومییەكە هی ئەوە، خوای گەورەش پێی فەرموون: دەستنیشانی وشكەساڵی و قات و قڕی و بەپیتی و خۆشگوزەرانی، هەموو ئەمانە لای خواوەیە.

مەبەست بە ئایەتی دووەمیش ئەوەیە كە هەرچی چاكەیەك دێتەرێی خەڵك، ئەوە لە فەزڵ و چاكەی خواوەیە، هەرچی خراپەیەكیشیان دێتەرێ، بەهۆی كردارەكانی خۆیانەوەیە، ئەگەرچی هەمووی لە قەدەری خوادا هاتووە، بۆیە

---

(١) - النساء: ٧٩.

(٢) - النساء: ٨٢.

زانایانی تەفسیر دەڵێن: ئەم ئایەتە سەرجەم موسڵمانان دەدوێنێت، نەوەك تایبەت بێت بە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

ئایەتەکە وەك ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە ﴿وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ﴾،[1] (تووشی هەر بەڵا و موسیبەتێك ببن، بەهۆی تاوانی خۆتانەوەیە و هێشتا خوای گەورە لە زۆرێك لە تاوانەکانتان ئەبوورێت).

بۆیە هیچ نەگونجانێك لەنێوان دوو ئایەتەکەدا نیە، هەموو شتێك لەرووی قەزا و قەدەرەوە لای خوایە، لە هەمان کاتدا هۆکارێکی کارەسات و چەرمەسەرییەکان، ئەنجامی کردەوەی خراپی خۆمانە.

لە کۆتایی ئەم بەشەشدا، یەکێك لەو کتێبە بەسوودانەی لەم بارەوە نووسراون، بریتیە لە کتێبەکەی مونقیز سەقار بە ناونیشانی (تنزيه القرآن الكريم عن دعاوى الطاعنين).

## بەشی سێیەم : گومانەکان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەمەش دابەش دەبێت بۆ دوو لق:

**لقی یەکەم:** گومانخستنە سەر پێغەمبەرایەتیەکەی.

**لقی دووەم:** تانەدان لە هەڵوێستەکانی ناو ژیانی.

لە دیارترین ئەو هەڵوێستانەش کە تانەیان لێ دەدەن، بریتین لە:

هاوسەرگیریی لەگەڵ عائیشە و صەفییە، مەسەلەی فرەژنیی، رووداوی بەنی قورەیزە، رووداوی عورەینیەکان.

سەبارەت بە یەکەمیان، ئەوە وەڵامدانەوەی بەوە دەبێت، بە بەڵگەی عەقڵیی و نەقڵی، پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ بسەلمێنێت، زانایانیش گرنگییان داوە بەم بوارە، ئەگەرچی زۆربەیان لایەنی موعجیزە هەستپێکراوەکان، یاخود لەتوانابەدەرکانیان زاڵ کردووە بەسەر بەڵگەکانی تردا.

---

(١) - الشورى: ٣٠.

لەراستیدا، هەمەچەشنەیی بەڵگەکان لەنێوان بەڵگەی عەقڵ و نەقڵدا، بۆ بەڵگەهێنانەوە تێروتەسەلترە، بەتایبەت کە لە قورئاندا بەڵگەی عەقڵیی زۆر هاتووە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی، چەندێك لە زانایانیش وەك پێشەوا غەزالی لە کتێبی (المنقذ من الضلال) و ئیبن تەیمیە لە شەرحی ئەصبەهانیە و (النبوات) یشدا هۆشیاریی ئەوەیان داوە کە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ تەنها لە موعجیزە هەستپێکراو و لەتوانابەدەرەکاندا کورت نابنەوە، بەڵکو جۆراوجۆرن.

هەروەك گرنگە ئاماژە بکەین بەوەی خەڵکی جیاوازن لە وەرگرتنی دڵنیایی بەهۆی ئەو بەڵگانەوە، هەیانە بە یەکێك لەو بەڵگانە دڵنیایی وەردەگرێت، هەشیانە دەبێت هەردوو جۆرە بەڵگەکەی بۆ بهێنیتەوە، بەڵام ئەوەی کە هەر کەسێکی ژیر و دادپەروەر کۆکە لەسەری، ئەوەیە کە هەموو بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ ئەوپەڕی یەکلابوونەوەو دڵنیایی دوور لە هەر گومان و دوودڵییەك دەبەخشن.

ئەمەش چەند بەڵگەیەك:

## یەکەم: بەڵگەی راستگۆیی و رەوشتبەرزییەکەی:

دیارە بانگەشەکەری پەیامێك، یان دەبێت باشترین و کامڵترین کەس بێت، یاخود دەبێت پەست و کەمڕەوشتترینیان بێت، جا چۆن ئەم دوانە بە یەك دەچوێنرێن؟

هەر درۆزنێك بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردبێت، دواجار نەزانی و درۆ و خراپەکاریی لێ بەدیارکەوتووە و هەرکەس بە کەمترین شێوە توانای جیاکردنەوەی شتەکانی هەبووبێت، بۆی دەرکەوتووە کە شەیتان زاڵ بووە بەسەر ئەو جۆرە کەسانەدا.

هەر راستگۆیەکیش بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردبێت، زانایی و راستگۆیی و چاکەکانی و هەمەچەشنەی کاری چاکەی دەرکەوتووە بۆ هەر کەسێك کەمترین توانای جیاکردنەوەی شتەکانی هەبووبێت، بە دەربڕینێکی تر (راستگۆترینی راستگۆکان، یاخود درۆزنترینی درۆزنەکان بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان کردووە، کەس ئەم دوانەی لێ تێکەڵ نابێت مەگەر نەفامترینی نەفامەکان، بەڵکو بەراوردی بارودۆخ و رەفتاری هەرکامیان، پێناسەی دەکات و دەیناسێنێت،

جیاکردنەوەی راستگۆ لە درۆزنیش لە بابەتی خوار بانگەشەی پێغەمبەرایەتیشدا بە چەندین شێوە دەکرێت، چ جای بانگەشەی پێغەمبەرایەتی).

ئەم دوو دەربڕینەی ئیبن تەیمیە[١] و ئیبن ئەبیلعیزی حەنەفی[٢] (رەحمەتی خوا لە هەردووکیان) بەڵگەیەکی زۆر جوان و عەقڵیی واقیعین، چونکە بابەتی پێغەمبەرایەتی بانگەشەیە بۆ هەواڵ و زانیارییەکی دیاریکراو، ئەو کەسەش کە ئەو هەواڵە دەدات، یان راستگۆیە، یاخود درۆزن، جیاکردنەوەی راستگۆ و درۆزنیش لە بانگەشە گەورەکاندا، زۆر بە ئاسانی دەکرێت و فێڵ و لەخشتەبردن لەو بوارەدا زۆر ناخایەنێت هەتا ئاشکرا دەبێت.

شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەمان بۆ روونەکاتەوە کە ناکرێت لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەکەیدا درۆزن بووبێت، چونکە دۆست و دوژمن شایەتی ئەوەیان بۆ داوە کە کەسێك بووە لەوپەڕی رەوشتبەرزی و پیاوەتی و سپاردەکاریدا، هەر لە سەرەتای پێگەیشتنیەوە، ناسراو بووە بە راستگۆیی.

بۆیە، هەرچی کتێبی دوژمنانی ئیسلام و گومانسازان هەیە، ئەمدیو و ئەودیویان بکەن، دەبینن کە تانەیان لێداوە، هەندێ هەڵوێستی کردەیی رەفتارییان وەك تانەیەك لە بەرامبەری بەکارهێناوە -کە زۆر دوور بووە لەو تۆمەتانەش- نەوەك تانەی ئەوەی لێ بدەن راستگۆ نەبووە، ئەمەش دانپێدانانێکی ناڕاستەوخۆیانە بەوەی راستگۆ بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێش بانگەشەکەی، ماوەیەکی زۆر لە مەککە لەناو قەومەکەی خۆیدا ژیاوەو تیایدا نازناوی (الصادق الأمین)ی پێ بەخشراوە، کاتێك یەکەمجار لە سەرەتای پەیامەکەوە چوویە سەر صەفا، پێی فەرموون (أرأيتم إن أخبرتكم أن خيلا تخرج من سفح هذا الجبل، أكنتم مصدقي؟)،[٣] (ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم لە لاپاڵی پشت ئەم شاخەوە سوپایەکی سوارە دێن، ئایا باوەڕم

---

(١) - شرح العقيدة الأصفهانية (١/١٣٨).

(٢) - شرح الطحاوية، ص ١٠٩.

(٣) -متفق عليه.

پێ دەکەن؟)، وتیان بەڵێ، ئەویش فەرمووی (فإني نذير لكم بين يدي عذاب شديد)،[1] (دەی هۆشیاریتان پێ دەدەم کە سزایەکی سەخت لە چاوەڕوانیتاندایە).

بەڵگەیەکی ڕاستگۆییەکەی ئەوەیە کاتێك پەڵەهەورێکی ڕەش و تاریك مەدینەی داپۆشی و بانگەشەی پووچی تۆمەتبارکردنی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بە زینا بڵاوبوویەوە، پێغەمبەری خوایش ﷺ زۆر ئەزیەتی پێ گەیشت و تەواو بێتاقەت بوو، بەڵام چی کرد؟ خۆ ئەگەر قورئان دانراوی خۆی بوایە، بۆچی یەکسەر پاکداوێنی هاوسەرەکەی ڕانەگەیاند لەکاتێکدا خەڵکیش باوەڕیان پێ دەکرد؟ بۆچی ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد لە بابەتەکەدا؟ لەناو خەڵکدا وتاری دەفەرموو و ڕایدەگەیاند سەری فیتنەکە (ئیبن ئوبەی) سەبارەت بە هاوسەرەکەی ئازاری داوە، بۆچی هیچکام لەوانەی نەدایەوە پاڵ خوا؟ هەتا پاش ماوەیەك وەحی بۆ دابەزی سەبارەت بە پاکداوێنی عائیشە.

کاتێك ئەبووسوفیان پێش موسڵمانبوونی چوو بۆ شام، ئەوکات سەرگەورەو سەرکردەی قورەیش بوو دژ بە پێغەمبەری خوا ﷺ، هیرەقلی گەورەی ڕۆم بانگهێشتی کرد هەتا لەوەوە زانیاریی لەسەر موحەممەد وەربگرێت، سەبارەت بە چەند بابەتێك پرسیاری لێکرد کە دەیویست بگاتە شارەزاییەکی ڕاستەقینە لەو بوارانەدا، یەکێك لە پرسیارەکانی ئەوەبوو (ئایا تۆمەتی درۆزنیتان دەدایە پاڵ؟) ئەبووسوفیان لە وەڵامدا وتی: نەخێر، هیرەقل دواتر قسەیەکی ژیرانەی کرد و وتی (لێم پرسیت ئایا پێش ئەوەی ئەو بانگەشەی بکات، تۆمەتی درۆزنیتان دەدایە پاڵ؟ تۆیش وتت نا، منیش تێگەیشتم ناکرێت دەست هەڵگرێت لە درۆکردن بەدەم خەڵکەوە و دەست بداتە درۆکردن بەدەم خواوە).[2]

هەروەها ئەو ڕۆژەی خۆرگیران ڕوویدا، لە هەمان ڕۆژدا ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، خەڵکی وتیان: لەبەر مەرگی ئیبراهیم ئەم خۆرگیرانە ڕوویداوە، دەبوو هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ چی بوایە بەرامبەر بەو قسە؟ پشتگیرییان

---

(١) - صحيح البخاري.

(٢) - صحيح البخاري، ٧.

بکات؟ یان هیچ نەبێت بێدەنگیی هەڵبژێرێت؟ بەڵکو چوویە ناو خەڵکەکەو وتارێکی بۆ فەرموون و ئەو بیروباوەڕە هەڵەی بۆ ڕاست کردنەوە و خوای گەورە بە گەورە دانا و فەرمووی (إن الشمس والقمر آيتان من آيات الله، لا يخسفان لموت أحد ولا لحياته، فإذا رأيتم ذلك ، فادعوا الله، وكبروا وصلوا وتصدقوا)،[١] (خۆرگیران و مانگ گیران، دوو ئایەت و بەڵگەن لە بەڵگە و نیشانەکانی خوا، لەبەر مەرگ و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن، جا ئەگەر خۆرگیران، یاخود مانگگیرانتان بینی، لەخوا بپاڕێنەوەو تەکبیر بکەن و نوێژ بەجێبگەیەنن و خێر و بەخشش بکەن).

بەڵگەیەکی تری ڕاستگۆییەکەی ئەوەیە کە هەموو قورئانی پیرۆزی گەیاند، هەرچەندە هەندێ ئایەتی تێدا بوو کە سەرزەنشتی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد، وەك فەرمایشتی (عَبَسَ وَتَوَلَّى، أَنْ جَاءَهُ الْأَعْمَى، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى)،[٢] (ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد، کاتێك پیاوە نابینانەکە هات بۆ لای، تۆ چووزانی، لەوانەیە ئەو پیاوە نابینایە هاتبێت بیەوێت خۆی لە تاوان پاك بکاتەوە)، یان (عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ)،[٣] (خوای گەورە لێت خۆش بێت، بۆچی مۆڵەتت پێ دان)، هەروەها (لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاةَ أَزْوَاجِكَ)،[٤] (بۆچی شتێك لە خۆت حەرام دەکەیت کە خوا بۆی بە حەڵاڵ بۆ داناویت، مەبەست بەوە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی هاوسەرەکانتە)، یاخود (وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ)،[٥] (شتێك لە دەروونی خۆتدا ئاشکرا ناکەیت کە خوا ئاشکرای دەکات، دەترسیت خەڵك تانەت لێ بدەن، خوای گەورە شایەنترە کە لێی بترسیت).

---

(١) - صحيح البخاري، الرقم ١٠١٠، صحيح مسلم، الرقم ١٥٤٧.

(٢) - عبس: ١-٣.

(٣) - التوبە: ٤٣.

(٤) - التحريم: ١.

(٥) - الأحزاب: ٣٧.

جا ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری خوا نەبوایە، ئەکرا ئەو ئایەتانە بگەیەنێت؟ چی ناچاری دەکرد ئەم قسانە بڵێت کە خەڵکی هەتا ڕۆژی دوایی دەیانخوێننەوە، ئەگەر مەسەلەکە ئەوە نەبێت کە فەرمانی پێکرابوو بیگەیەنێت؟

## دووەم: بەڵگەکانی قورئان لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرایەتیەکەی:

ئەم قورئانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێنای بۆ خەڵك، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەرایەتیەکەی، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە لای خواوە هاتووە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ نەخوێندەوار بوو و نووسین و خوێندنەوە و شیعری نەدەزانی، بەڵام ئەم قورئانەی هێنا و تەحەددای هەموو مرۆڤایەتی پێکرد و داوای لێکردن -ئەگەر ئەیانەوێت بانگەوازەکەی هەڵبوەشێننەوە- با هاوشێوەیەکی ئەو قورئانە بهێنن، بەڵکو با تەنها دە سوورەتی وەك سوورەتەکانی قورئان بهێنن، بەڵکو تەنها یەك سوورەت، کەچی پێیان باشترە لەگەڵی بجەنگن نەوەك یەك سوورەتی وا بهێنن، چونکە نەیاندەتوانی ئەوە بکەن، لەکاتێکدا چاکترین هۆکار هەبوو بۆ ئەوەی شتی وا بکەن، ئەویش ئەوپەڕی دوژمنایەتی و دەربازبوون لە شکست بوو، هاوکات گەورەترین پێناوەکانی ئەنجامدانیشی لەبەردەستیاندا بوون هەتا هەرچی لە داهێنانی قسەی مرۆڤە -با چەندە بەهێزیش بێت- لەبەرامبەر پێغەمبەردا بەکاریبهێنن، چونکە ئەوان لە لووتکەی ئەدەب و ڕەوانبێژی و بەیاندا بوون، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەهاتە کۆڕ و کۆبوونەوەیانەوەو ئەم فەرمایشتەی خوای بۆ دەخوێندنەوە ﴿قُلْ لَئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنْسُ وَالْجِنُّ عَلَى أَنْ يَأْتُوا بِمِثْلِ هَذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا﴾،[1] (پێیان بڵێ: ئەگەر مرۆڤەکان و جنیەکانیش هەرهەموویان کۆببنەوە لەسەر ئەوەی هەوڵ بدەن نموونەیەکی وەك ئەم قورئانە بهێنن، ناتوانن نموونەی بهێنن با هەندێکیان دەستبار و سەرخەری هەندێکی تریان بن).

پاشان پێی دەفەرموون ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا

---

(١) - الإسرا: ٨٨.

النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ)،[١] (ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەو قورئانەی دامانبەزاندووە بۆ سەر بەندەکەمان، دەی سووڕەتێکی وەك سووڕەتی ناو قورئان بهێننەوە و شایەت و پشتیوانەکانی خۆیشتان لە غەیری خوا بێنن با شایەتیتان بۆ بدەن، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن، ئەگەر ئەمەتان نەتوانی کە بە دڵنیاییشەوە نایتوانن، دەی لە ئاگرێکی دۆزەخ بترسن کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردە و ئامادە کراوە بۆ بێباوەڕان).

بەم چەشنە تەحەددای دەکرد و هەواڵی ئەوەشی پێ دەدان کە هەرگیز ناتوانن شتی وا بکەن و باشت وایە خۆیان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، چونکە حەقە، کەچی نەیاندەتوانی وەڵامی بدەنەوە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە قورئان دەستکردی مرۆڤ نیە.

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا هەندێ هەواڵی یەکلاکەرەوەی بێ دوودڵیی هەن کە ناگونجێت کەسێکی درۆزنی بانگەشەکار، سەرکێشی بە شتی واوە بکات، چونکە ئەگەر ڕوونەدات، ئەوە بەسە بۆ بەڵگەی درۆزنیەکەی، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هاوەڵانی وازبهێنن لە باوەڕپێهێنانی، چونکە درۆی کردووە بەرامبەریان، بەتایبەت ئەگەر پێویست نەکات ئەو قسەش بکات، یان بەلایەنی کەمەوە بە دەستەواژەی دوور لە جەختکردنەوە هەواڵی هەندێ ڕووداوی داهاتوو بدات، یان هەندێ دەستەواژە کە دواتر لێکدانەوەی جیاواز هەڵبگرێت، چونکە سەرکێشیەکە واتە لە ئەگەری شکستدا هەموو بانگەوازەکە دەدۆڕێنێت، بەڵام ئەی هاوار، ئەمە کاتێك وادەبێت کە قورئان لەلایەن خودی موحەممەدەوە دانرابێت، بەڵام کاتێك لای خواوە هاتبێت، سەرت سوڕنەمێنێت ئەو بەڵێنە گەورە و بەهێز و جەختلێکراوانەی تێدا بخوێنیتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت (مَنْ كَانَ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَنْصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ لِيَقْطَعْ فَلْيَنْظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ)،[٢] (هەرکەس گومانی وایە خوا پێغەمبەرەکەی سەرناخات لە دنیا و ئاخیرەتدا، ئەوە

---

(١) - البقرة: ٢٣-٢٤.

(٢) - الحج: ١٥.

با فیڵ و پیلانەكانی بەرزی بكاتەوە بۆ ئاسمان، پاشان ئەگەر توانای هەبوو ئەو سەركەوتنە بپچڕێنێت، پاشان با تەماشا بكات و بزانێت بە نەخشە و فڕوفێڵی هیچی وای بەدەستدەخات، واتە با چی هۆكارە بیگرێتەبەر، ئەگەر لە خەفەتدا خۆیشی بكوژێت، بەدڵنیاییەوە خوا پێغەمبەرەكەی سەردەخات).

لە ئایەتەكەدا خوای گەورە بەڵێنی داوە هەر لە دنیادا و پێش ئاخیرەت، سەركەوتن یاوەری پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەبێت، چونكە راناوی (ینصره) دەگەڕێتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)،[١] (ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووەو خۆیشمان دەیپارێزین)، لە ئایەتەكەدا چەند جار جەخت كردنەوەی دەستەواژەیی هەیە لەسەر پاراستنی قورئان، ئەم هەواڵەش بۆ داهاتووە، بەڵێنەكەش هاتەدی، هەرچەندە هەر لە سەردەمی هاتنی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئەمڕۆمان، یەكدوای یەك هێرش كراوەتەوە سەر ئیسلام و موسڵمانان.

هەواڵدانێكی تری قورئان ئەم فەرمایشتەیە (الم، غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ، فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ، بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ)،[٢] (ئەلیف، لام، میم، ڕۆمەكان تێكشكێنران لە نزمترین شوێنی سەرزەویدا، ڕۆمەكان پاش ئەو شكستەیان سەردەكەونەوە، لە ماوەی سێ بۆ نۆساڵدا، پێش ئەو سەركەوتنە و دوای ئەوەش هەموو شت هەر بەدەست خوایە، لەو ڕۆژەشدا باوەڕداران دڵخۆش دەبن بە سەركەوتنێك كە خوا دیبەخشێت، خوا هەركەسێكی بوێت سەری دەخات، خوای گەورە باڵادەست و میهرەبان و بەبەزەییە بۆ باوەڕداران).

پرسیارەكە لێرەدا ئەوەیە: ئەگەر بهاتبا و ئەو جەنگە ڕوونەدایە؟ ئەگەر جەنگەكە هەڵگیرسایە، بەڵام ئەنجامەكە لە بەرژەوەندی فارسەكان بوایە؟ چی دەبوو ئەگەر ڕۆم سەربكەوتنایە، بەڵام پێش، یان دوای ئەو ماوە دیاریكراوە؟

---

(١) - الحجر: ٩.

(٢) - الروم: ١-٥.

بەڵگەیەكی تری قورئانی بریتیە لە بەسەرهاتی ئوممەتانی پێشوو، ئەمەش یەكێكە لە بەڵگە گەورەكان، چونكە عەرەبەكان لەو كاتەدا شارەزا نەبوون بە وردەكارییەكانی بەسەرهاتی پێغەمبەران لەگەڵ قەومەكانیاندا، ئەهلی كیتابیش لە كتێبەكانیاندا لەوبارەوە شتێكیان لابوو، ئەو پێكەوەگونجانەی هەواڵدانەكانی پێغەمبەری خوا بۆ رووداوەكان و ئەو زانیاریانەی لای ئەهلی كیتاب، بەڵگەی راستی و بەهێزیە، نەك ئەوەی بە پێچەوانەوە كەسانێك گومانی دی دەبەن، هەروەك هەموو ئەو بەسەرهاتانەی لە قورئاندا هاتووە، لە كتێبەكانی ئەواندا هەموویان نین، وێڕای ئەوەی دەقی قورئان راستكردنەوەی بەشێك لە زانیاریەكانی ناو كتێبەكانی ئەوانە، دەی پیاوێكی نەخوێندەوار كە نووسین و خوێندنەوەی نەزانیوەو لەنێوەندی مەككەدا ژیاوە، چۆن توانی ئەم زانیاریانە بهێنێت؟ ئەمە وێڕای جوانی خستنەڕوو و ئەوپەڕی رەوانبێژی و لووتكەی وەسف و پەندوەرگرتنی كۆتا و یادخستنەوەی سەرەتا كە ئەگەر كەسێك شارەزا بێت بە هەموو نووسینەكانی ئوممەتانی پێشوویش، ناتوانێت شتی وا بنووسێت، چ جای كەسێك كە لە هەموو تەمەنیدا یەك لاپەڕەشی نەخوێندۆتەوە.

بۆیە دەبینین خوای گەورە لەنێو بەسەرهاتەكانی قورئاندا ئاماژەی بەمە داوە، دوای بەسەرهاتی پێغەمبەر مووسا، چەند جوان ئەم ئایەتانە هاتون (وَمَا كُنْتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنْتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ، وَلَكِنَّا أَنْشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ وَمَا كُنْتَ ثَاوِيًا فِي أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَلَكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ، وَمَا كُنْتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَكِنْ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ لِتُنْذِرَ قَوْمًا مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ)،[١] (خۆ تۆ -ئەی موحەممەد- لە رۆژئاوای دۆڵی سەیناء نەبوویت كاتێك لەگەڵ مووسادا قسەمان كرد و فەرمانمان پێی راگەیاند، هەروەها تۆ لە ئامادەبوانی ئەو شوێنە و باسوخواسە نەبوویت، پاش ئەوەش چەندەها ئوممەتی ترمان دروست كرد و ئەوانەش تەمەنیان درێژەی كێشا، وە تۆ -ئەی موحەممەد- لای خەڵكی مەدیەن نەبوویت وەك ئەوەی كە مووسا لەوێ بوو تا ئایەتەكانی ئێمە بخوێنیتەوە بەسەریاندا، بەڵام ئێمە تۆمان ناردووە

---

(١) - القصص: ٤٤-٤٦.

بۆ لای خەڵکی و ئەو هەواڵانەش لە وەحیەوە بە تۆمان ڕاگەیاندووە، هەروەها تۆ لای کێوی تووڕ نەبوویت کاتێك لەوێوە قسەمان کرد لەگەڵ مووسادا، بەڵام ئەم وەحی و قورئانە کە بۆ تۆمان ناردووە ڕەحمەتێکە بۆ ئەوەی خەڵکێك کە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە ئاگاداریان بکاتەوە، تۆ ئاگاداریان بکەیتەوە، بەڵکو ئەوانیش پەندو ئامۆژگاری وەربگرن و بیربکەنەوە).

هەروەها لە بەسەرهاتی پێغەمبەر نووحدا، خوای گەورە دەفەرموێت (تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنْتَ تَعْلَمُهَا أَنْتَ وَلَا قَوْمُكَ مِنْ قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ)،[1] (ئەم بەسەرهاتە، لە هەواڵ و زانیاریەکانی غەیبە کە بە وەحی بۆ تۆمان دابەزاندووە لەکاتێکدا پێشتر نە خۆت و نە قەومەکەشت ئەوەتان نەدەزانی، دەی خۆڕاگربە، چونکە سەرەنجام بۆ لەخواترسانە).

چەندین بواری تری بەڵگەکانی قورئان لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ هەن کە لەبەرئەوەی نامەوێت لێرە درێژەی پێ بدەین، باسیان ناکەم.

## سێیەم: بەڵگەی کەماڵی تەشریعات و بیروباوەڕ و ئەو ڕەوشتانەی کە لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ باسکراون:

فیقهناسان و فەرموودەناسان و مێژوونووسان و زانایانی تەفسیر و شرۆڤەکارانی فەرموودە- پاش ئەوەی چواردە سەدەمان لە هاتنی پەیامی پێغەمبەرایەتی تێپەڕاندووە- هێشتا لێنەبوونەتەوە لە دەرهێنانی گەنجینەی دەقەکانی قورئان و سوننەت، کتێبخانە گەورەکان جێی ئەو کتێبانەیان نەماوە کە زانایانی بوارێك لە بوارەکانی دەقە شەرعییەکانی وەك حوکمە فیقهیەکان بەرهەمیان هێناون، دەبینیت هەزارەها نووسراو لە یەك بەشی دیندا ئاوایە، لەکاتێکدا هەموویان پشت دەبەستن بەو دەقانەی قورئان و سوننەت کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاندونی.

بەڵگەکە لە زۆریدا نیە، بەڵکو لە گشتگیریی و صەلاحیەت و وردەکاریدایە، کاتێك بیر لەوە دەکەینەوە کە ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارە لە ماوەی بیست و سێ

---

(١) - هود: ٤٩.

ساڵی پێغەمبەرایەتیەکەیدا سەرقاڵ بووە بە هەندێ کارەوە کە سەختە شاخەکانیش بەرگەی بگرن، گەورەییەکەمان جوانتر بۆ دەردەکەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ سەرقاڵ بوو بە بانگەوازی قەومەکەی و دەچوو بۆ لای وەفدی حاجییان لە مەککە بەو هیوای پەناگەیەکی دەست بکەوێت بۆ بانگەوازەکەی، چاودێریی بارودۆخی هاوەڵە بێدەسەڵاتەکانی ناو مەککەی دەکرد، ئاگاداری کۆچیان بوو بۆ حەبەشە، دواتر چوویە مەدینە و لەوێ دادوەر و فەرمانڕەوا و وتاربێژ و پێشەوا و سەرکردەی سوپایش بوو، نۆ ماڵی هەبوو، نزیکەی بیست غەزای ئەنجامدا، تیایدا ژمارەیەك لە هاوەڵانی لەدەستدا، مامی و ئامۆزاکانی و مەولاکەی لەو غەزایانەدا لەدەستدا، ئەی ئیتر کەی دەستی بەتاڵ بوایە بۆ داهێنانی ئەم سیستمە تەشریعیە تێروتەسەلە، ئەگەر مەسەلەکە وەحیەك نەبێت کە خوای گەورە بۆی دابەزاندووە.

ئەگەر بڕوانیتە ئەو بابەتانەی یاد و گەورەیی و سیفەتەکانی خوا کە لە دەقی قورئان و سوننەتدا باسیانکراوە، هێندەت بەسە هەتا بۆت دەربکەوێت ئەوەی گەیاندوویەتی پێغەمبەرێکی نێردراوی خوا بووە، چونکە هەرکات خەیاڵی مرۆیی رووەو ئەوەچوو بیر لە خوای بەدیهێنەر بکاتەوە، ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە بەرزەی کە لە قورئان و سوننەتدا سەبارەت بە زاتی اللە باسکراوە، چونکە لای خواوە دەرچووە، دەی هیچ کەس نیە لە خوا شارەزاتر بێت بە زاتی خۆی.

چاوی دڵ وردبکەرەوە سەر سوورەتی فاتیحە و ئایەتەلکورسی و سوورەتی ئیخلاص، ئینجا بڕوانە بۆ عەقڵی مرۆیی بە تەنها، بزانە دەتوانێت وەك ئەو ئایەتانە وەسفی خوای بەدیهێنەر بکات؟

لە بواری رەوشتی و خولگەی بەهایی رەفتاری ناو قورئان و سوننەتیشدا، جوانی و گونجان و تێروتەسەلی چاکسازی بۆ خودی تاك و کۆمەڵگەی لەخۆ گرتووە، لە کتێبی (کامل الصوره) دا لەژێر ناونیشانی (فەرموودەی پێغەمبەری خوا چی دەبەخشێت بە رەفتاری مرۆیی؟) جۆرێك ئاماژەم بەم بابەتە داوە، دکتۆر موحەممەد دەڕازیش رەحمەتی خوای لێ بێت، لەو بارەوە کتێبێکی گەورەی نووسیوە بە ناونیشانی (الدستور الأخلاقی في القرآن)، هەروەك کتێبەکانی فەرموودەش پڕن لەو بەش و ناونیشانانەی باسی چاکە و پەیوەندی و رەوشتبەرزی دەکەن،

تەنانەت فەرموودەناسان کتێبی سەربەخۆیان لەسەر داناون، وەك کتێبی (الأدب المفرد) ی پێشەوا بوخاری کە هەزار فەرموودەی تێپەڕاندووە.

## چوارەم: بەڵگەکانی موعجیزەی هەستپێکراو:

گێڕانەوەی ئەو کەسە ڕاستگۆیانەی کە ناسراون بە زەبت و دادپەروەری، بە تەواتور و بە سەنەدی پەیوەست هەتا سەردەمی پێغەمبەرایەتی، چەندین گێڕانەوەیان هێناوە کە ژمارەیەك لە سوننەتە گەردوونیەکان لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕێڕەویان گۆڕاوە، چەندین هەڵوێست کە زانایان لە کتێبی سەربەخۆی ناسراو بە (بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی) کۆیانکردوونەتەوە، لەوانە:

خەڵکی مزگەوت گوێیان لە نرکەو ناڵەی ئەو قەدی دارخورمایە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی وتارەکاندا پاڵی پێوە دەدایەوە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ جێی هێشت و لەشوێنیدا مینبەرێکی بەکارهێنا، ئەو قەدە نرکەوناڵەی بیسترا.

جووڵەی درەخت و ملکەچبوونی لەبەردەستی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەتا سەتری پێغەمبەری خوا ﷺ بکات لەکاتی دەست بەئاوگەیاندنیدا.

زۆرکردنی خواردن لە چەندین هەڵوێستیدا.

هەڵقوڵانی ئاو لەبەردەستیدا.

ئەمانە و چەندین هەڵوێیستی تر کە هەرکەس بیەوێت زانیاری زیاتر لەو بارەوە وەربگرێت، با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (دلائل النبوە) ی بەیهەقی و بابەتەکانی تایبەت بە فەزڵی پێغەمبەری خوا و بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی لەناو کتێبەکانی فەرموودەدا بەگشتی.

ئەو تەواتورە مەعنەویەی گێڕانەوەکان، هیچ ڕێگایەکی نکووڵیکردنی نیە، مەگەر نکووڵی لەوە بکەیت ئەو سەرچاوە ڕاستە سەرچاوەی مەعریفە و زانیاریی نیە، زانایانی پسپۆڕییە جیاجیاکانی شەرعی و سروشتی و کۆمەڵایەتی باس لە هەندێ ڕاستی مێژوویی پەیوەست بە زانست دەکەن کە دەگەڕێنەوە بۆ پێغەمبەری

خوا ﷺ و سەرچاوەکەیان هەمان ئەو گێڕانەوە ڕاستانەن، چی وادەکات کەسێك ئەمەی لا پەسەندە، کەچی لەولاوە پەسەندی نەکات؟

بەڵکو گێڕانەوەی موعجیزەکان پێوەری پەسەندکردنیان لەخۆ گرتووە، بە چەشنێك هیچکەس ناتوانێت بەرپەرچی بداتەوە، پێوەرێك کە لە بابەتی تردا بەدیی ناکەیت، وەك ناوبانگی ئەرستۆ بە مەنتیق و حاتەمی تائی بە بەخشندەیی و ئیبن سینا بە فەلسەفە.

ئەگەر بەڵگەی موعجیزەکان لەگەڵ بەڵگەکانی پێشوودا بدەینە دەم یەك، مەسەلەکە ڕوونتر دەردەکەوێت و گومانەکان کز دەبن و دەچنەوەیەك هەتا نامێنن.

## پێنجەم: بەڵگەی هەواڵدانە پێشوەختەکانی پێغەمبەرانی پێشوو کە موژدەی هاتنی پێغەمبەری خوایان داوە:

خوای گەورە بۆمان باس دەکات کە مووسا و عیسا موژدەیان داوە بە هاتنی موحەممەدی پێغەمبەری خوا و دەفەرموێت (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ)، (ئەو کەسانەی شوێن ئەو پێغەمبەرە دەکەون کە نێردراوێکی نەخوێندەوارەو و جوولەکە و گاورەکانیش لای خۆیانەوە سیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرە دەزانن کە لەلایەن نووسراوە لە تەورات و ئینجیلدا)، هەروەها سەبارەت بە پێغەمبەر عیسا دەفەرموێت (وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ)، (عیسا دەیوت، منیش موژدەتان پێ دەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای منەوە دێت و ناوی ئەحمەدە).

هەروەها خوای گەورە هەواڵی پێداوین کە ئەهلی کیتاب پەڕاوەکانی بەردەستیان دەستکاری کردون، بەڵام دەستکاریکردنەکە هەموو ئەوەی نەگرتۆتەوە کە خوای گەورە دایبەزاندووە، لەوەش بەشێك لە حەق لەلایان ماوەتەوە، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، ئەو دەستکاریکردنە تەنها تایبەت نەبووە بە ماوەی پێش پێغەمبەر موحەممەد ﷺ، بەڵکو دوای ئەویش دەستکاری کراوە، بەتایبەت لە وەرگێڕانەکانی کتێبی پیرۆز بۆ سەر زمانی عەرەبی.

ASTANA

ویڕای هەموو ئەمانەش، زانایان و توێژەرانێکی موسڵمان هەوڵیانداوە بڕێك دەقی ناو کتێبی پیرۆز زەق بکەنەوە کە موژدەی هاتنی پێغەمبەرێك یان شەفیعێکیان تێدایە کە ئەو پێغەمبەرە لە دوای پێغەمبەر عیساوە دێت، چەند دەقێکی تریش کە وەسفی ئوممەتەکەی و شارەکەیان کردووە، تەنانەت بڕێك دەق کە پێیان وایە راشکاوانە ناوی پێغەمبەریان تێدا هاتووە، بەڵام لە تەفسیر، یان وەرگێڕانەکاندا دەستکاری کراون، بۆ نموونە:

لە ئینجیلی (یوحەننا- ئیصحاحی شانزە لە بڕگەی ٥ بۆ ١٤) فەرمایشتی عیسا هاتووە (ئێستا، وا من دەچم بۆ لای ئەوەی ناردوومی، کەستان ناتوانێت لێم بپرسێت: بۆ کوێ دەچیت؟ بەڵام لەبەرئەوەی من ئەمەم پێ وتن، خەفەت دڵەکانتان پڕ دەکات، بەڵام حەقتان پێ دەڵێم: ئەوە بۆ ئێوە باشترە من بچم، چونکە ئەگەر نەچم، موعەزی نایەت بۆ لاتان، بەڵام ئەگەر چووم، -خوا- دەینێرێت بۆتان) هەتا دەگاتە ئەوەی دەڵێت (من بڕێك شتی زۆرم هەن تا پێتان بڵێم، بەڵام ئێوە ئێستا ناتوانن بەرگە بگرن، بەڵام هەرکات رووحولحەق هات، ئەو رێنموونیتان دەکات بۆ هەموو حەق، چونکە ئەو لەخۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو هەرچیەك دەبیستێت ئەوە دەڵێت، هەواڵتان پێ دەدات بە هەندێ شت کە دێن و روودەدەن، ئەو من بەرز رادەگرێت).

ئەمەش موژدەدانە بەو پێغەمبەرەی لەدوای خۆیەوە دێت و سیفەتەکەشی ئەوەیە کە لەخۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو هەرچیەك دەبیستێت ئەوە دەڵێت، هەواڵی هەندێ شتیش دەدات کە دێن و روودەدەن، ئەوەش سیفەتێکە کە فەرمایشتی خوامان بیردەخاتەوە سەبارەت بە موحەممەد ﷺ کە دەفەرموێت (وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى، عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى)، (لە هەواو ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات، ئەوەی دەیڵێت، تەنها وەحیە و لەلایەن خوای گەورەوە بۆی دەنێردرێت، جبریل فێری کردووەو لەلایەن خوای گەورە وەحی بۆ هێناوە کە زۆر بەهێز و هێزێکی سەرسەختی هەیە).. هەروەها دەفەرموێت (فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ).

ئەمە ویڕای ئەوەی کە ژمارەیەك لە توێژەران، لەوانەش د.مونقیز سەقار -کە پسپۆڕی ئەو بوارەیە- سەبارەت بە واتای وشەی (موعەزی) باسیان کردووە کە

پێیان وایە وەرگێڕانی وردی دەقە بنەڕەتیە یۆنانییەکەی (باراقلیت) نیە، بەڵکو واتای وردتری وشە یۆنانیەکە بریتیە لەو کەسەی کە سوپاسی زۆری هەیە، واتە ناوەکە واتای ئەحمەد یان موحەممەد یان حامید دەگەیەنێت نەوەك موعەززی، ئەگەر وابێت، ئەمەش یەکێکی ترە لە لادان و دەستکاریکردنەکانیان.

هەروەها لە کتێبی پیرۆزدا باسی مەککە کراوە بەو ناوەی کە لە قورئاندا هاتووە (بەککە)، لە مەزمووری ٨٤ ژمارە ٦ دا دەبینین دەڵێت: (بەختەوەری بۆ ئەوانەی بە هەمیشەیی لە ماڵەکەتدا دەمێننەوەو تەسبیحاتت دەکەن (سلاە) بەختەوەری بۆ کەسانێك سەربڵندییان بە تۆیە و ڕێی ماڵت لە دڵەکانیاندایە، بە دۆڵی (بکاء) دا تێدەپەڕن و ..).

لە نوسخە عەرەبیە هاوبەشەکەدا لە هەمان شوێندا هاتووە دەڵێت (بەختەوەری بۆ ئەوانەی لە ماڵەکەتدا دەمێننەوە، ئەوانە بەردەوام تەهلیلەی (لا إله إلا الله دەڵێن) تۆ دەکەن، بەختەوەری بۆ ئەوانەی سەربڵندییان بە تۆیە و بە دڵەکانیان بەرەو لات دێن، بە دۆڵی وشکەڵاندا تێدەپەڕن و دەیکەنە کانیاو، بەڵکو داباریینێك کە باران دایبگرێتەوە، لە شاخێکەوە دەچن بۆ شاخێکی تر..)

لە نوسخەی یاسووعیدا دەڵێت (بەختەوەری بۆ دانیشتوانی ماڵەکەت، چونکە ئەوانە دەست هەڵناگرن لە تەسبیحاتت، بەختەوەری بۆ ئەوانەی عیزەتیان بە تۆوەیە و لە دڵەکانیان هاتن ڕووەو تۆ هەیە، ئەگەر تێپەڕین بە شیوی بەلەساندا، کانیاوی لێ دەتەقێنن)، ئەمانە سێ نوسخەی جیاوازن، هەموویان جیاوازن لە نوسخە ئینگلیزیەکە کە تیایدا هاتووە دەڵێت:

- As they pass through the Valley of Baca

لێرەدا دەقەکە بە (بەککە) هاتووە لەسەر شێوازی ناو، چونکە بە پیتی گەورە دەستپێدەکات، لە هەندێ نوسخەی تری ئینگلیزیشدا هەروایە.[1] لە دائیرەتولمەعاریفی

---

(١) - سوودمان وەرگرتووە لە گرتەیەکی ڤیدیۆیی موهەندیس فازل عەبدولا کە لە بەرنامەی کەناڵی الناس لەگەڵ خالید عەبدولا پێشکەشی کردووەو لە کەناڵی یوتیوب دابەزێنراوە.

کیتابییشدا (Encyclopedia of The Bible) دەبینین قسەیەك لەسەر بەلەسان هاتووە، ئەو دەستەواژەی کە لە یەکێك لە نوسخە عەرەبییەکاندا هاتووە (بەلەسانی راستەقینە کە نووسەرە کۆنەکان باسیان کردووە، بەلسەمی مەککەیە کە میصر لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە هاوردەی دەکرد، وەك جارانی کۆن).

هەندێ لە توێژەران ئاماژە بەوە دەدەن رستەی (لە شاخێکەوە دەچن بۆ شاخێکی تر) ئاماژەیە بە رێکردنی نێوان صەفا و مەڕوە، خواش زاناترە.

لە کۆتاییدا بابەتێکی تری نێو کتێبی پیرۆز دێنم کە موژدە دەدات بە رووناکیەك کە لە چیاکانی فارانەوە -کە چیاکانی مەککەن- دەدرەوشێتەوە، لە سیفری تەسنیە، ئیصحاحی ٣٣ (١-٣) دا هاتووە (ئەوەش ئەو بەرەکەتەیە کە موسای پیاوی خودا بۆ نەوەی ئیسرائیل داوای کرد، بەر لە مردنی، گوتی: خوا لە سیناوە هات و لە سێعیرەوە بەسەریاندا هەڵهات، لە کێوی فارانەوە درەوشایەوە وهەزاران هەزار فریشتەی پیرۆزی لەگەڵ بوو، لە بنارەکانی باشوورەوە. هەروەها ئەی ئەوەی گەلانت خۆشدەوێت، هەموو پیرۆزەکانی لە دەستی تۆن، ئەوان لەلای پێت کڕنۆش دەبەن، ڕێنمایی لە تۆ وەردەگرن).

لە سیفری حبقوقیشدا هاتووە (پەروەردگارا، هەواڵی تۆم بیست، پەروەردگارا، لە کارەکانت ترسام، لە سەردەمی ئێمە دووبارەیان بکەوە، با لە سەردەمی ئێمە بزانرێن، لە تووڕەییدا بەزەیی بهێنەرەوە یادت! خودا لە تێمانەوە هات، پیرۆزەکە لە کێوی فارانەوە هات، شکۆی ئەو ئاسمانی داپۆشیوە و ستایشی ئەو زەوی پڕکردووە.)

دکتۆر مونقیز سەقار دەڵێت: (لەو شوێنانەی کە تیایدا باسی فاران لە کێبی پیرۆزدا هاتووە، وا دەردەکەوێت دەکەوێتە بیابانی فەلەستین لە باشووریەوە، بەڵام تەواراتیش باس لەو دەکات کە ئیسماعیل لە وشکانی فاران گەورە بووە (بڕوانە تەکوین ٢١/٢١) ، لە رووی مێژووییشەوە زانراوە کە ئیسماعیل لە مەککەی پیرۆز لە حیجاز گەورە بووە، موسڵمانان پێیان وایە دەقی هەواڵدان بە دەرکەوتنی عیسا لە سعێر لە فەلەستین و دواتر دەرکەوتنی موحەممەد لە کێوی فاران کاتێك دێت و هەزاران پاکی لەگەڵدایە و پاڵپشتن بە شەریعەتێك لای خواوە.

ئەمەش لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بەدیهاتووە، لەبەر چەند مەسەلەیەك:

**یەکەم:** کێوی فاران هەمان کێوی مەککەیە کە ئیسماعیل لەوێ نیشتەجێ بوو، تەورات سەبارەت بە ئیسماعیل دەڵێت (خودا لەگەڵ کوڕەکە بوو، گەورە بوو و لە چۆڵەوانیدا دەژیا، بووە تیرهاوێژ. لە چۆڵەوانی فاران نیشتەجێ بوو، دایکیشی لە خاکی میسر ژنێکی بۆ هێنا).[1]

**دووەم:** بوونی ناوچەیەك کە ناوەکەی فاران بێت لە باشووری سیناء، ڕێگر نیە لە بوونی فارانێکی تر، ئەویش ئەو شوێنەیە کە ئیسماعیل تیایدا نیشتەجێ بوو، بۆ نموونە ناوی سعێر بۆ ئەو ناوچە هاتووە کە دەکەوێتە خاکی ئەدوم کە ئێستا لە ئەردەنە، هەمان ناو لە چەند شوێنی تری کتێبی پیرۆز هاتووە، زۆری ناوهێنانەکەش ڕێگر نەبووە لەوەی ئەو ناوە بەکاربێە بۆ شاخێك لە نێوەندی فەلەستین لە ڕۆژئاوای قودس لەناو زەوی (سبط یهوذا) (بڕوانە یەشووع ١٥/١٠).

ئەکرێت لەوانە بپرسین کە سوورن لەسەرئەوەی فاران هەمان ئەو فارانەی سینایە، ئەو قوددوسە کێیە کە لەو شاخەتانەوە درەوشایەوە لەکاتێکدا بچووکترین پەیوەندی نایبەستێتەوە بە هیچ ڕووداوێکی گرنگی مرۆڤایەتیەوە.

**سێیەم:** ئەو قسەیە پەسەند نیە کە دەڵێت دەق باس لە شتێکی ڕابردوو دەکات، چونکە دەربڕینی بابەتەکانی داهاتوو بە شێوە دەربرینی ڕابردوو لە زمانی کتێبی پیرۆزدا شتێکی باوە.

**چوارەم:** دەڵێین: ئەگەر مەسەلەکە تەنها ئاماژەدانە بە بڵاوبوونەوەی گەورەیی و شکۆی خوا -وەك ئەوەی هەندێ لە نووسەرانی جوولەکە بانگەشەی بۆ دەکەن- ئەی بۆچی بەتایبەت باسی کێوی فاران کراوە؟ چونکە شکۆ و گەورەیی خوا لە سنووری فاران یان کێوی سعێردا ناوەستێت.

**پێنجەم:** ئەوەی جەخت لەوە دەکاتەوە کە مەسەلەکە پەیوەستە بە هەواڵ و پێشبینی سەبارەت بە هەزاران قدیس کە لە هەندێ شوێندا بە (پاکەکانی فریشتەکان) واتە

---

(١) - پەیدابوون: ٢١/ ٢٠-٢١.

پاكەكانی شوێنكەوتەكان ناویان هێنراوە، ئەو دەربڕینە مەبەست پێی شوێنكەوتەیە، وەك لە سیفری روئیادا هاتووە كە (میخائیل و فریشتەكانی لەگەڵ تنین جەنگان، تنین و فریشتەكانیشی جەنگان..)، جا فاران جگە لە سەردەمی دەركەوتنی موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی، چ كاتێكی تر ئەو هەزاران پاكەی بەخۆوە دیوە؟

**شەشەم:** ئەوەی لە سیفری حبقوقدا هاتووە، پاڵپشتی قسەی موسڵمانان دەكات، چونكە دەڵێت: (خودا لە تێمانەوە هات، پیرۆزەكە لە كێوی فارانەوە هات شكۆی ئەو ئاسمانی داپۆشیوە و ستایشی ئەو زەوی پڕكردووە پڕشنگی ئەو وەك تیشكی بەرەبەیانە، لە دەستیەوە ڕووناكی دەبارێت، لەوێدا توانای شاردرابووەوە. پەتا لەپێشیەوە ڕۆیشت، گرانەتاش لەدوای هەنگاوەكانی ئەو بوو. ڕاوەستا و زەوی هەژاند، تەماشای كرد و هەموو گەلەكانی لەرزاند. چیا دێرینەكان كوتران، گردە لەمێژینەكان هاتنە خوارەوە، بەڵام یەزدان جاویدانییە).[١]

دەقەكە شایەتی لەسەر ئەوە دەدات كە پێغەمبەرایەتیەكی زاڵ وەك ڕووناكی دەدرەوشێتەوەو دەنگی بانگی ئەو پێغەمبەرە بە تەسبیحات، هەموو ئاسۆكان دەگرێتەوە.

وەك نووسەرەوانی كتێبی پیرۆز دەڵێن، تیمان وشەیەكی عیبریە بە واتای (باشوور)، بۆیە دەقی كاسۆلیكی تەورات دەڵێت (خوا لە باشوورەوە دێت و قودوسیش لە كێوی فارانەوە)، لەبەرئەوەی قسەبۆكراوان لە فەلەستینن، بۆیە ئەو وەحیەی موژدەی لەبارەوە دراوە، لە باشوورەوە دێت، واتە لە نیمچەدوورگەی عەرەبەوە، بۆیە قودوس لە كێوی فارانەوە دەنێردرێت، لە هەموو ئەمانەوە ئەو قودوسەی لە شاخەكانی فارانەوە دەدرەوشێتەوە، پێغەمبەری ئیسلامە، چونكە هەموو سیفەتە باسكراوەكانی پێغەمبەری فارانی تێدا بەدیهاتووە و لە پێغەمبەرانی تردا بەدینەهاتووە.

لەو كتێبانەی لەمبارەوە نووسراون، بریتین لە:

(تباشير الإنجيل والتوراة بالإسلام ورسوله) لە نووسینی نەصروڵا ئەبووتالب.

(يجدونه مكتوبا عندهم)، لە نووسینی فەیصەل عەلی كاملی

(هل بشّر الكتاب المقدس بمحمد) لە نووسینی مونقیز سەقار.

(١) - حەبەقوق: ٣/٣-٦.

## گومانەکان لەسەر چەند هەڵوێستێکی دیاریکراوی ناو ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ

لە دیارترینی ئەو گومانانەش، هاوسەرگیریەتی لەگەڵ عائیشە و ڕووداوی بەنوقوڕەیزە و هاوسەرگیریی لەگەڵ صەفییە.

### هاوسەرگیریی لەگەڵ عائیشە :

سەبارەت بە بابەتی هاوسەرگیریی لەگەڵ عائیشە، ئەوان قسە لەسەر کەمی تەمەنی عائیشە دەکەن لەکاتی هاوسەرگیریدا و بەوهۆیەوە تانە دەدەن لە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەڵامەکەش بەم چەشنەیە:

**یەکەم:** بەختەوەرترین کەس بەو هاوسەرگیرییە، عائیشەیە ڕەزای خوای لێ بێت، بەسەرهاتەکانی وابەستەیی و خۆشەویستی نێوان عائیشە و پێغەمبەر ﷺ جوانترین نموونەی پێشەنگییە لەمبارەوە، خۆی بۆیە ترس هەیە لە کەمیی تەمەن لە هاوسەرگیریدا، نەبادا ئافرەتەکە لەڕووی جەستەیی یان دەروونیەوە زیانی پێ بگات، دەی ئەمە لەو هاوسەرگیرییە پیرۆزەدا ڕووینەداوە.

**دووەم:** قبووڵکردن یان بەڕەوا دانەنانی هاوسەرگیری لەو تەمەنەدا، دەگەڕێتەوە بۆ نەریت نەوەك حەقیقەتی خۆی، وەگەرنا ئەگەر هەر گرفتێك لە هاوسەرگیریەکەدا هەبوایە، یەکەم کەس سەرکۆنەی ئەو هاوسەرگیرییەیان دەکرد، بێباوەڕانی قوڕەیش و جوولەکە و دووڕووەکان دەبوون کە هیچ دەرفەتێکیان لەدەست نەدەدا بۆ لێدانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەك چۆن بۆ تانەلێدانی لە ڕێی عائیشەوە لە ڕووداوی ئیفکدا، هەلیان بەفیڕۆ نەدا، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا لە چەندین ئایەتدا باسی ئەو تانە و تەشەرانەی کردووە کە بێباوەڕان و دووڕووەکان ئاڕاستەی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد، لەبارەیەوە دەیانوت: جادووگەر، ساعیر، کاهین، پشتی بە خەڵکانێکی تر بەستووە، مرۆڤێك ئەو شتانەی فێر دەکات، خوای گەورە باسی ئەوەش دەکات کە

ڕەخنەی ئەوەیان هەبووە چۆن خواردن دەخوات و بەنێو بازاڕدا دەگەڕێت، دەیانوت ئیشی بووە بە گوێگرتن، ئەمانە و چەندین تۆمەتی تر، بەڵام باسی ئەوەی نەکردووە تانەیان دابێت لەو هاوسەرگیرییەی، وەك چۆن لە سوننەت و مێژووشدا هیچ باسێك ئەوەمان بۆ نەگوازراوەتەوە ڕەخنەی وایان هەبووبێت، لەکاتێکدا زۆر ڕەخنە و تانەی تریان لە فەرموودە و کتێبەکانی مێژووشدا تۆمار کراون.

**سێیەم:** هەندێ جار ئافرەت لە تەمەنی نۆ ساڵیدا باڵغ دەبێت، باڵغبوونیش واتە توانای سکپڕی و منداڵ خستنەوەی هەیە، ئەگەر مەسەلەکە تەنها هاوسەرگیری بوایە لەگەڵ کیژێکی منداڵدا، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان ئەو کاتەی عائیشەی لە تەمەنی شەش ساڵیدا مارەکرد، ئەوکاتیش دەیگواستەوە، بەڵام ماوەی سێ ساڵ چاوەڕێی کرد هەتا پێگەیشت و گەیشتە ئاستی گونجاو بۆ هاوسەرگیریی، هەروەك جیهانی ڕۆژئاوایش تا نزیکانێکی ئەم سەردەمەش، لە تەمەنێکدا هاوسەرگیریان لەگەڵ کچاندا دەکرد کە ئەمڕۆ ئەو تەمەنە بە پێچەوانەی یاسا و بێ سەلیقەیی تەماشا دەکەن.

جیاوازیەکە لەوەدایە، پەیوەندی جنسیی لەخوار تەمەنی یاسایی هاوسەرگیرییەوە، لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە هیچ دژایەتیەکی ڕاگەیاندنی بەرامبەر ناگیرێتەبەر لەکاتێکدا بۆ هاوسەرگیری دەستی لێ شل ناکەن، بەڵکو لە ڕووی یاساییەوە بەپێی وڵات یان هەرێمەکان، بە ڕەوایان داناوە لە تەمەنێکی کەم و سەرەتاوە پەیوەندی جنسی هەبێت، هەندێك دڵنیا نین لە شتی وا هەتا ئەو کاتەی پێیان دەڵێیت تەمەنی هاوسەرگیری لە هەندێ وڵاتی ڕۆژئاواییدا لە یانزە و دوانزە و سیانزە ساڵیەوە ڕێی پێ دراوە، دیوی دڵنیاییەکەش لەوەدایە کە فشاری کاریگەریی ڕۆژئاوا لای هەندێ کەس وایکردووە کە ڕۆژئاوا بکەنە تەرازوویەك بۆ چاکە و خراپە، لەڕاستیدا ئێمە پێویستمان بەمە نیە، بەڵام بەهۆی جیاوازی ئیمان و تێگەیشتنی خەڵك، هەمەچەشنەیی بەڵگەکان باشە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: خەڵکانێك دەیانەوێت بە نکوولێکردن لە فەرموودەی هاوسەرگیری عائیشە بەرگریی لە پێغەمبەر ﷺ بکەن، لەکاتێکدا ئەو فەرموودەی سەبارەت بە تەمەنی هاوسەرگیری عائیشە هاتووە، بوخاری و موسلیمیش هێناویانە،

ئەو جۆرە کەسانە دوای ئەوەی نکووڵی لە دەقی فەرموودەی بابەتەکە دەکەن، برێك گێڕانەوە دەکەن بە بەڵگە کە وای لێ تێگەیشتون تەمەنی هاوسەرگیریەکەی هەژدە ساڵ، یاخود نزیك لەو تەمەنە بووە، لە بابەتێکدا کە بە ناونیشانی (مژاری راوبۆچوونی د.عەدنان ئیبراهیم لەسەر تەمەنی عائیشە لەکاتی هاوسەرگیریدا) بڵاومکردۆتەوە، قسەم لەسەر هەندێك لەو گومان و پرسیارە وروژێنراوانە کردووە، لەو نووسینەی منیش باشتر، کتێبەکەی فەهد غفێلیە بەناونیشانی (السنا الوهاج في سن عائشة عند الزواج).[١]

مامۆستا حسام عبدالعزیزیش لە کەناڵی یوتیوب لە بەرنامەی (بالعقل) سێ ئەڵقەی پێشکەش کردووە سەبارەت بە تەمەنی عائیشە لەکاتی هاوسەرگیریدا، ئەڵقەکان زۆر جوان و بەچێژ و سوودبەخشن و شیاوی بڵاوکردنەوە.

## رووداوی بەنوقورەیزە:

ئەوەی لای گومانگەرا مەسیحی و مولحیدەکان سەبارەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ باوە، ئەوەیە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن پێغەمبەر ﷺ منداڵانی جوولەکەی بەنوقورەیزەی کوشتووە، هەروەها دەڵێن کوشتارەکە تۆقاندن و دڕندەیی لەخۆ گرتووە،

بۆ مشتومڕی ئەمانە ئەم خاڵانە دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** پێویستە هۆکاری کوشتاری بەنوقورەیزە بخەینەڕوو، ئەویش بریتیە لە ناپاکییە ناشیرینەکەیان لە سەختترین بارودۆخدا، کاتێك لە گەمارۆی ئەحزاب دژ بە مەدینە، دەستیان لەگەڵ دوژمن تێکەڵکرد، لەکاتێکدا بەڵێنێك لەنێوان ئەوان و پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبوو، کەچی لەو بارودۆخە سەختەدا کە خوای گەورە باسی دیمەنی نارەحەتیەکەی کردووە، بەڵێنەکەیان شکاند، خوای گەورە دەفەرموێت (إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ

---

(١) - لە بەرگی دووەمی کتێبی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی، کە بەڕێز د. عبدالواحد محمد صالح نووسیویەتی، زۆر بە وردی باسی هاوسەرگیریی عائیشە و تەمەنەکەی خستۆتە بەر لێکۆڵینەوەو بە ئەنجامێکی بەهێزەوە لێی دەرچووە، خوێنەر دەتوانێت لەمبارەوە سوودی زیاتر لەو کتێبە وەربگرێت. وەرگێڕ.

الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا، هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا)،[١] (كاتێك بێباوەڕەكان لە لای سەروو و لە خوارەوە بۆتان هاتن، لە سەرسامیی و سەختی دیمەنەكەدا، چاوەكان لە شوێن خۆیان لاچوون و دڵەكان لە شوێن خۆیاندا بەرزبوونەوە تا گەیشتن بە گەروو لە ترسدا، وە جۆرەها گومانتان بە خوا ئەبرد، ئا لەوێدا باوەڕداران تاقیكرانەوەو تێكشڵەژان، تێكشڵەژانێكی سەخت).

تەنها ئەوەش نا، بەڵكو هەوڵیاندا دەست بگەیەننە ژن و منداڵی موسڵمانان لە مەدینەدا، مەگەر جگە لە كوشتن، شایەنی چ بڕیارێكی تر بوون؟!

**دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵانی بەنوقورەیزەی نەكوشت، بەڵكو تەنها لە پیاوەكانی كوشت، خۆیشی ڕێگریی كردووە لە كوشتنی ژن و منداڵ، وەك چۆن لە دەستەواژەكەی بوخاری و موسلیمدا هاتووە (جەنگاوەرەكانیان بكوژرێن)، ئەمەش لە حوكمی سەعدی كوڕی موعاز سەبارەت بە بەنوقورەیزە بڕیاری لەسەر درا.

**سێیەم:** هەڵوەشاندنەوەی بەڵێنەكە بەكۆمەڵ بوو، هەندێ ڕاستەوخۆ و ئەوانی دیكەش ڕەزامەندییان لەسەر نیشاندا، بۆیە سزاكەش بەكۆمەڵ بوو.

### هاوسەرگیریی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ صەفییە:

گومانسازان دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەمان ڕۆژدا كە مێردەكەی صەفییە كوژرا، بێ ئەوەی لەسەری بوەستێت، گواستیەوە، ئەمەش ئەوپەڕی دڕۆیە، وێڕای ئەوەی ئەمە پێچەوانەی بەسەرهاتەكەیە كە بوخاری و موسلیم هێناویانە، بەڵام لای گومانسازانی دژ بە ئیسلام باو و بڵاوە و خەڵكێكیش بەو قسانە كاریگەر دەبن، هۆكاری ئەو كاریگەربوونەش، لاوازی ڕەخنەی مێژووییە.

دەقی بەسەرهاتەكەی لە صەحیحی بوخاریدا وا هاتووە (لەگەڵ خۆی بردیە دەرەوە هەتا گەیشتینە سەدوڕەوحا و لاماندا، ئینجا لەوێ گواستیەوە)،[٢] دەربڕینەكەی موسلیم بە ڕاشكاوانە باسی عیددە دەكات.[٣]

---

(١) - الأحزاب: ١٠-١١.

(٢) - صحيح البخاري (٣٥٦) (٢٢٣٥).

(٣) - صحيح مسلم (١٣٦٥).

هەروەك هەرچیەك لە صەفییەوە گێڕدراوەتەوە، ئاماژەیە بە رازیبوونی و نیشاندانی خۆشحاڵی بەرامبەر بەو هاوسەرگیریەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، بەڵکو بەسەرهات و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ گواستوینەتەوە، بەڵکو وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، دەچوو بۆ شوێنی ئیعتیکافی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەلای دادەنیشت و قسەی لەگەڵ دەکرد.[١]

ئەگەریش بوترێت: خۆ ئەگەر نارەزایەتیشی هەبووبێت، ئەوە نەگێردراوەتەوە و پێچەوانەکەی باسکراوە، ئەوە لە وەڵامدا دەڵێین: خۆ هەڵوێستی هەندێ ئافرەت باسکراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای کردون و ئەوانیش رازی نەبون بە هاوسەرگیرییەکە، وەك بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەوزاعیەوە هێناویەتی کە دەڵێت: لە زوهریم پرسی، کام خێزانەی پێغەمبەر ﷺ بوو کە پەنای بە خوا گرت لە پێغەمبەر ﷺ؟ ئەویش وتی: عوروە لە عائیشەوە هەواڵی پێداوم کە ئیبنەتەلجەون کاتێك پێغەمبەر ﷺ چوویە ژوورەوە بۆ لای لەکاتی گواستنەوەدا و لێی نزیك بوویەوە، وتی: پەنابەخوا دەگرم لێت، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (لَقَدْ عُذْتِ بِعَظِيمٍ ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ)،[٢] (پەنات بە گەورەیەك گرت، بڕۆرەوە بۆ نێو کەسوکارت).

---

(١) - صحيح البخاري (١٩٣٠).

(٢) - صحيح البخاري، الرقم ٥٢٥٤.

## بەشی چوارەم : گومانەکان سەبارەت بە تەشریعی ئیسلامی

هێشتا لە جۆری یەکەمی گومانەکانی سەردەمین کە ئەویش بریتیە لەو گومانانەی مەبەست لێیان لێدانە لە بنەڕەتی ئیسلام، وتیشمان ئەوانە چوار بەشن، ئەمەش بەشی چوارەمە کە باسی دەکەین.

دیارترین ئەو پرسیار و گومانانەی لەم بەشەدار دەورووژێنرێن، سێ شتن:

**یەکەم:** بانگەشەی ستەملێکراویی ئافرەت لە ئیسلامدا.

**دووەم:** بانگەشەی ئەوەی ئایینی ئیسلام بەهۆی شەعیرەی جیهادەوە، ئایینی تیرۆر و خوێنڕشتنە.

**سێیەم:** بانگەشەی ئەوەی حەدد و سزادانە شەرعییەکان، دیوێکی وەحشیگەرییان لەخۆ گرتووە.

### یەکەم: بانگەشەی ستەملێکراویی ئافرەت لە ئیسلامدا

گومانگەراکان، بۆ ستەملێکراویی ئافرەت بەڵگە بە کۆمەڵێك تەشریعی ئیسلامیی دەهێننەوە کە نەیانتوانیوە لە حیکمەتیان تێبگەن، یان بڕێك نەریتی هەڵەی هەندێ موسڵمان دەکەنە بەڵگە و بە نەزانی، یان بە ئەنقەست، دەیدەنەوە پاڵ شەریعەت.

بابەتی گومان لەسەر ئافرەت لە ئیسلامدا، زۆر توێژەر قسەی لەسەرکردووە، چەندین زانای موسڵمان لە بابەت و توێژینەوەو کتێب و کۆڕ و وانە و پڕۆژەکانیاندا، پرسیار و گومانەکانی ئەم بوارەیان وەڵامداوەتەوە، کتێبخانەی خوێنراو و بیستراو و بینراوی ئیسلامیش، پڕە لەو بەرهەمانەی تایبەت بەم بوارە.

لە دیارترین ئەو گومانانەی لەم بوارەدا دەورووژێنرێن -هەرچەندە مشتومڕ و وەڵامدانەوەی پێویستی لەسەرە- و منیش لە کتێبی (كامل الصوره ٢) دا وەڵامم داوەتەوە و لێرەشدا لەبەر بەربڵاوی و بەناوبانگیەکەی لە گوتاری ڕۆژئاواییدا

باسی دەکەم، هەرچەندە حەزم بە شتی دووبارە نیە، ئەویش بریتیە لە مەسەلەی میراتی ئافرەت، کاتێك دەوترێت ستەمی لێکراوە کاتێك نیوەی میراتی پیاو دەبات، وەڵامی ئەم گومانەش لە چەند روویەکەوەیە:

**یەکەم:** میرات چەند حاڵەتێکی هەیە، لە هەندێکیاندا ئافرەت لە پیاو زیاتری بەردەکەوێت، هەیانە ژن و پیاو تیایدا یەکسانن، هەشیانە ئافرەت تیایدا میرات دەبات و پیاو نایبات، جۆری وایشی هەیە کە پشکی ئافرەت لە پشکی پیاو کەمترە، جا ئەگەر ئافرەتێك مرد و مێرد و کچێکی لەدوای خۆی جێهێشت، ئەوە لێرەدا کچەکە لە پیاوەکە زیاتر میرات دەبات، ئەگەر کوڕێك مرد و باوك و دایك و چەند منداڵێکی لەدوای خۆی جێهێشت، ئەوە پشکی باوك و دایك یەکسانە، لەبەر فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێت (وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ)، (بۆ دایك و باوکی، بۆ هەرکامیان شەش یەکی بۆ هەیە)لەکاتێکدا لە هەمان ئایەتدا خوا فەرموویەتی (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ)، (نێرینە پشکی دوو مێینەی هەیە)، بەڵام گومانسازان ئەمە نازانن یان خۆیانی لێ گێل دەکەن.

هەروەك یەکێك لەو حاڵەتانەی تر کە نێرو مێ یەکسان میرات دەبەن، ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت (وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ فَإِنْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ)،[1] (ئەگەر کەسێك مرد و کوڕ و باوك و منداڵی بەجێنەهێشت، یان ئافرەتێك بە هەمان شێوە ئەو مێرد و شتانەی بەجێنەهێشت وە ئەگەر هاتو خوشك و برای لە دایکی هەبوو، ئەوا هەریەکێك لەوانە شەش یەك ئەبات، ئەگەر ژمارەیان لەوە زیاتر بوو، ئەوکات بەشدارن لە سێ یەکەکەدا)، ئەمە لە حاڵەتی برایەتی لە سەری دایکەوە.

**دیوی دووەم:** نێر ئەگەرچی لە چەند حاڵەتێکدا پشکی دوو مێینەی هەیە، بەڵام لە روانگەی شەرعەوە راسپێردراوەو لەسەری پێویستە لەکاتی هاوسەرگیریدا مارەیی بدات بە ئافرەت، بە درێژایی ماوەی ژیان تا ئەو کاتەی ئەو ئافرەتە هاوسەریەتی، خەرجیی خێزانی بکێشێت با تەنانەت ئافرەتەکە دەوڵەمەندیش بێت، دوای ئەمە، هێشتا ئەوە بە زۆر دەزانرێت کە لە میراتدا دوو بەرامبەری هەبێت؟

---

(١) - النساء: ١٢.

**دیوی سێیەم:** سەرچاوەی ئەو رقلێبوونە ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەو یکسانییە رەهایەی نێوان نێرو مێیە لە هەموو شتێکدا کە خۆیان بڕیاریان لەسەرداوەو بە باشی دەزانن، ئەو یەکسانییەش پێچەوانەی سروشتی پێکهاتەی هەرکامیانە و لەگەڵ دادپەروەریدا ناگونجێت، لەکاتێکدا دەبینیت لە ئیسلامدا ئەصل و بنەڕەت لە تشریعاتدا بریتیە لە یەکسانی تا ئەو کاتەی پێچەوانەی سروشتی ئافرەت نەبێت یاخودا بۆی باش نەبێت، بۆ نموونە دەبینین مافی ئەوەی داوە بە ئافرەت خۆی بە زێڕ برازێنێتەوە چونکە مێیینەبوونی وادەخوازێت خۆی برازێنێتەوەو بە شمەکی جوانکاری خۆی جوان بکات، لەکاتێکدا ئەم دەرفەتە بە پیاو نەدراوەو ڕێگریی لێکراوە، یاخود دەبینین لە قورئان و فەرموودەشدا بە توندی هەڕەشە لەو کەسە کراوە -کە ئەگەر جیهاد واجب بوو- وازی لێ بهێنێت، بەڵام ئەمە بۆ پیاوانە و ئافرەتان ناگرێتەوە.

پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە (رەزای خوای لێ بێت) هێناویەتی دەڵێت: داوای مۆڵەتم کرد لە پێغەمبەر ﷺ بۆ جیهاد، ئەویش فەرمووی (جیهادی ئێوەی ئافرەتان حەجە)،[1] ئیبن بەتتال رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (فەرموودەکەی عائیشە بەڵگەی ئەوەیە کە جیهاد لەسەر ئافرەتان واجب نیە، بەڵام لەو فەرمایشتەدا کە فەرموویەتی (جیهادی ئێوەی ئافرەتان حەجە) مەبەست ئەوە نیە مافی ئەوەشیان نەبێت خۆبەخشانە بچن بۆ جیهاد، بەڵکو لەسەریان واجب نیە).[2]

ئەوانەی کە داوای یەکسانی رەهای ئافرەت و پیاو دەکەن، ئەگەر تەماشای واقعیان بکەیت، دەبینیت لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ بانگەشەکەی خۆیاندا راست ناکەن، بۆ نموونە ئەو کەسانەی لەسەر کورسی دەوڵەتن، رێژەی ئافرەت لەگەڵ پیاواندا بەراورد ناکرێت، بەڵکو زۆرجار جێی باسکردن نیە، ئایا ئەمە لەبەرئەوەیە کە ئەوان دەزانن رەگەزی پیاو لەو کارەدا لە ئافرەت بەتواناترە؟ یان لەبەرئەوەیە بنەماکانیان لەبەردەم حەز و ئارەزووی دەسەڵاتدا دادەڕمێن؟ یاخود لەبەرئەوەیە کە بنەڕەتی بانگەوازی یەکسانییەکەیان ساختەیە.

---

(١) - ٢٨٧٥.

(٢) - شرح صحيح البخاري (٥/٧٥).

لەلایەکی ترەوە ئەگەر بە بیرکردنەوەیەکی رەخنەگرانە و دیدێکی گشتگیری پشکنەرانە لەگەڵ قسەی ئەوانەدا مامەڵە بکەین کە بانگەشەی ئەوە دەکەن ئافرەت لە ئیسلامدا ستەملێکراوە، بەو نیازەی ئەو کەلێنانە ئاشکرا بکەین کە درز و کەلێن دەخاتە گوتاریانەوە، دەبینین لەم بوارەدا ئیشیان بووە بە فێڵ و ساختە، لەوانە:

**یەکەم:** ئەوان تێکەڵیی دەکەن لەنێوان نەریتی هەندێ لەوانەی کە دەدرێنەوە پاڵ ئیسلام و ستەم لە ئافرەت دەکەن لەگەڵ حوکمی ئیسلامیدا.

بۆ نموونە: کاتێك سەرپەرشتیاری ئافرەتێك بەزۆر ئافرەتەکە دەدات بە شوو، ئەوان ئەم ستەمە دەدەنەوە پاڵ ئیسلام، چونکە ئەو کەسەی ئەمەی کردووە موسڵمان بووە، لەکاتێکدا راستیەکەی ئەوەیە کە ئیسلام رێگری کردووە لە نەریتی وا، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت (لَا تُنْكَحُ الْأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ)، (بێوەژن بە شوو نادرێت هەتا پرسی پێ نەکرێت و رای وەرنەگیرێت، کچیش بەشوو نادرێت هەتا خۆی مۆڵەت نەدات)، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی کچ چۆنە؟ فەرمووی (ئەوەیە بێدەنگ بێت).[١]

**دووەم:** باسی ئەو لایەنانەی رێزداریی ئافرەت ناکەن کە ئیسلام بڕیاری بۆ داوە کە لەوانەیە لە هیچ شوێن و سەردەم و سیستمێکی تردا ئەوەی دەست نەکەوێت، ئەمەشە لە مافی گەورەی دایکدا بەدیدەکرێت، کەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە، درك بەوە دەکات کە دایك لە ئیسلامدا حەقێکی پێ دراوە کە جگە لە حەقی خوا و پێغەمبەرەکەی، هیچ مافێکی لەو بالاَتر نیە، دەبینیت پاش فەرمانکردن بە یەکخواپەرستی، فەرمان دەکات لەگەڵ دایك و باوکدا چاك بیت (وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا)، لەپاڵ سوپاسکردنی خوای گەورەدا، هانمان دەدات بۆ سوپاسکردنی دایك و باوك (أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ).

پێشەوا بوخاریش لە صەحیحەکەیدا لە ئەبووهورەیرەوە هێناویەتی کە دەڵێت: کابرایەك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ کەسێك لەپێشترە هاوەڵیی چاکی بکەم؟ فەرمووی (دایکت)، وتی ئەی دواتر؟

---

(١) - صحيح البخاري، الرقم ٥١٣٦، صحيح مسلم، الرقم ١٤١٩.

فەرمووی (دایكت)، وتی: ئەی دواتر؟ فەرمووی (دایكت)، وتی ئەی دواتر؟ فەرمووی (ئینجا باوكت).[١]

**سێیەم:** بیری ئەو حوكمانەیان نەماوە كە تایبەتن بە ئافرەتەوەو لەبەرامبەر ئەو لێتوندكردنەوەی لەئاست پیاواندا بەكارهاتووە، بۆ ئافرەتان لەسەرسووككردنێك هەیە بەو چەشنەی لەگەڵ جیاوازی نێوان ژن و پیاودا بگونجێت، بۆ نموونە:

ئافرەت بۆی هەیە زێڕ بپۆشێت و بۆ پیاو حەرامە.

ئافرەت بۆی هەیە جلی ئاوریشم بپۆشێت و بۆ پیاو حەرامە.

پیاو لەسەری واجبە وەك خەرجیەكی بەردەوام، سامانی خۆی خەرج بكات بۆ ژنەكەی با تەنانەت ژنەكەشی دەوڵەمەند بێت، بەڵام ئەو خەرجیە لەسەر ئافرەت نیە.

- بە بۆچوونی دروستتری وتەی زانایان- پێویستە پیاو ئامادەی نوێژی بەكۆمەڵی ناو مزگەوت بێت، بەڵام ئەوە بۆ ئافرەت واجب نیە.

سەرانە لە پیاوانی ناموسڵمان وەردەگیرێت، بەڵام لە ئافرەتانیان وەرناگیرێت.

ئیبنولقەییم لە كتێبەكەیدا (أحكام أهل الذمة)، دەڵێت: (سەرانە لەسەر منداڵ و ئافرەت و شێت نیە، ئەمە رای هەرچوار مەزهەبەكە و شوێنكەوتەكانیانە).

ئیبنولمونزیر دەڵێت: نەمدیوە هیچ كەس رای جیاوازی ئەوانی هەبێت، ئەبوومو حەممەد لە موغنیدا دەڵێت (نەماندیوە هیچ زانایەك پێچەوانەی ئەمە بڵێت).[٢]

**چوارەم:** خۆیان گێل دەكەن لەو هەموو شوێنەوارە خراپانەی بەهۆی لادان لە شەرعی خواوە تووشی ئافرەت بووە.

بۆ نموونە: ساڵانە ملیۆنەها كۆرپەلە لەباردەبرێن كە هۆكارەكەی بوونی پەیوەندی ناشەرعیە، مەگەر ئەو كۆرپەلانە مافی ژیانیان نیە؟ بە چ تاوانێك دەكوژرێن؟

---

(١) - ٥٩٧١.

(٢) - أحكام أهل الذمة لابن القيم (١٤٩/١)، المغني لأبي محمد ابن قدامة (٣٣٨/٩)، الإجماع لابن المنذر (ص ٦٢).

ASTANA

# گومانەکان سەبارەت بە تەشریعی ئیسلامی

## گومان بەرامبەر بە جەنگ و جیهاد لە ئیسلامدا

ئەمە لەو بابەتانەیە کە زۆرترین هەستیاریی لای ناموسڵمانان دروست کردووەو دەماودەم قسەی لەسەر دەکرێت و ناتوانین لێرەدا کە بە کورتی باسی بابەتەکان دەکەین، هەموو شتێکی لەبارەوە باس بکەین، بەڵام چەند ئاماژەیەکی مەنهەجی هەن کە باشە باس بکرێن، ئاماژەکان لایەنی هەڵە و شێواندنی نێو گوتاری گومانسازانی دژ بە ئیسلام لەبەرامبەر شەعیرەی جیهاد لەخۆدەگرن، لەوانەش:

**یەکەم:** ئەوانە لە روانگەی کۆمەڵە جیهادیی یان جەنگاوەریەکانی سەردەمەوە کە دەدرێنەوە پاڵ ئیسلام، تێڕوانینی خۆیان بەرامبەر بە شەعیرەی جیهاد بنیاد دەنێن، ئەم بڕیارەش مەنهەجیی و زانستیش نیە، بەڵکو راستتر ئەوەیە کە ئەو کۆمەڵانە بخرێنەبەر دادگای ئیسلام نەوەك بە پێچەوانەوە، واتە کردەوەکانیان بخرێنە بەر دەقەکانی قورئان و سوننەت سەبارەت بە جیهاد و ئاراستەکانی، هەرچیەك لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجا، باشە، هەرچیەکیش نەگونجا، دەدرێتەوە بە رووی ئەو کەسەی دایهێناوەو کاری پێ دەکات.

ئەو پرسیارەی لەبەرامبەردا ئاراستەی گومانگەراکان دەکرێت، ئەوەیە کە ئایا بە هەمان رێبازی تاوانباریی تیرۆریستی بڕیار لەسەر ئیلحاد دەدەن بەهۆی ئەو تاوانە دڕندانەی کە شیوعیە مولحیدەکان لە سەردەمی نوێدا ئەنجامیانداوە، یاخود ئەگەر دادگاییەکە بۆ ناموسڵمان بوو، تەرازووەکە کێشەی تێدەکەوێت؟!

**دووەم:** گومانسازان نازانن، یان خۆبێئاگا دەکەن لە لایەنی رەحمەت و نەرمونیانی لە حوکمەکانی جیهاد لە ئیسلامدا.

بۆ نموونە: ئەو یاسا ئیسلامیەی لە دەقەکانی قورئان و سوننەتدا هاتووە، دەقێکی روونی تێدایە سەبارەت بەوەی دروست نیە ژن و منداڵ بکوژرێن،[1]

---

(١) -بڕوانە صحيح البخاري، الرقم ٣٠١٥.

هەروەها دەقێکی روون سەبارەت بە دەستگرتنەوە لە کوشتنی جەنگاوەران ئەگەر هات و وازیان هێنا لە بێباوەڕی،[١] دەقێکی روون لەسەرئەوەی ئەگەر بێباوەڕان یان ئەهلی کیتاب سەرانەیان دا، رێیان پێ بدرێت لەسەر بێباوەڕیی و ئاینی خۆیان بمێننەوە،[٢] دەقێکی روون کە ناپاکیی بەرامبەر هەموو کەسێك حەرام دەکات،[٣] دەستخۆشی لەو کەسە کراوە کە خواردنی خۆی دەدات بە بەندکراو، دەقی روون سەبارەت بەوەی جەخت دەکاتەوە لە حەرامێتی شێواندنی جەستەی کوژراوانی دوژمن،[٤] دەقی تێدایە سەبارەت بە پەنادانی هەر جەنگاوەرێکی دوژمن کە بیەوێت گوێ بگرێت بۆ ئیسلام، ئینجا ئەگەر باوەڕیشی نەهێنا، بە سەلامەتی بگەیەنرێتەوە شوێن پەنای خۆی.[٥]

ئەم هەموو واتا جوان و رەوشتە بڵندانە لە جەنگدا تەنها لای موسڵمان هەن و لە لای کەسانی تر هاوشێوەی ئەمانە بەدیناکرێت.

**سێیەم:** ملیۆنەها مرۆڤ لەبیر دەکەن کە لە مێژووی کۆن و هاوچەرخدا لەسەر دەستی ناموسڵمانان کوژراون، خۆ ئەگەر بە هەمان شێواز کە مامەڵە لەگەڵ ئیسلامدا دەکەن، ئاواش مامەڵەیان بکردایە لەگەڵ ئەو ئایین و دەوڵەت و ئاڕاستانەی کە سوپا بەشداربووەکانی ئەو جەنگانە سەر بەوان بوون، ئەوە پێش ئەوەی دژ بە موسڵمانان قسە بکەن، شەرمەزاریی بێدەنگی دەکردن.

پاش ئەم سێ خاڵە، دەڵێم: جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان پاڵنەرەکانی جەنگ لە ئیسلام و پاڵنەرە جەنگیەکانی ناموسڵمانان، ستەمە جەنگێك کە لەپێناو ئایینێکدا دەکرێت کە خوا دایبەزاندووەو فەرمانی کردووە بەرگریی لێ بکرێت، هاوتا بکرێت لەگەڵ جەنگێك کە لەپێناو ئایینێکی لاڕێبوو، یان مەزهەبێکی ساختەی دانراودا بەرپا دەکرێت.

---

(١) - بڕوانە لە بەسەرهاتی ئوسامەی کوڕی زەید، البخاري، ٢٥ و ٦٨٧٢

(٢) - سورە التوبە: آیە: ٢٩، صحیح البخاري (٣١٥٩)، صحیح مسلم (١٧٣١).

(٣) - صحیح مسلم (١٧٣١)، (١٧٣٦).

(٤) - صحیح البخاري، الرقم ٢٤٧٤.

(٥) - سورە التوبە: آیە ٦.

پاڵنەری جەنگ لە ئیسلامدا تەرم خستن و لەناوبردنی بێباوەڕان نیە بە کوشتنیان، وەك چۆن مەبەست ئەوە نیە بە ستەم و سەرکەشی زاڵ بێت بەسەریاندا، بەڵکو پاڵنەرەکە بڵاوکردنەوەی ئایینی خوا و رزگارکردنی خەڵکە لە دۆزەخ و کەشێك بڕەخسێنرێت خەڵك سەرپشك بن لەنێوان هەڵبژاردنی ئایین بە کەنارخستنی ئەو خۆسەپێنانەی کە شمشێریان لەسەر گەردنی کەسانی بێدەسەڵات داناوە، بوونی چەند نموونەیەکی ناو مێژووش کە پێچەوانەی ئەم بنەمایە بووبێت، لەکارخستنی ئەم بنەمایە نیە، بەڵکو سەرکۆنەکردنی لادەرەکەی لێ دەکەوێتەوە.

بەم چەشنە کۆتاییمان هێنا بە دیارترین ئەو گومانانەی دەورووژێنرێن بە ئامانجی لێدانی بنەڕەتی ئیسلام.

## جۆری دووەم: ئەو گومانانەی مەبەست لێیان گومانخستنە سەر بنەڕەتە چەسپاوە شەرعیەکانە

لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکەدا وتمان مەبەست بە بنەڕەتە چەسپاوەکان: ئەو حوکم و گێڕانەوە شەرعیانەن کە ئەهلی سوننەو جەماعە کۆکن لەسەرئەوەی جیا لەو حوکم و گێڕانەوانەی راجییان لەسەرە، دەستیان پێوەبگرن

زۆرێك لە پرسیار و گومانەکانی سەردەم لەسەر بنەڕەتە چەسپاوەکان، دەگەڕێنەوە بۆ پێنج بەش:

سوننە، ئیجماع، مەنهەجیەتی تێگەیشتن لە دەق، هاوەڵان، حەددە شەرعییەکان.

### بەشی یەکەم: گومانەکان لەسەر فەرموودە

گومانەکان لەسەر فەرموودە لە هەموو چەشنەکانی تر، زیاتر دەورووژێنرێن، زۆر بابەتی تریش دێنەوە سەر ئەمە، زۆرجار دەبینیت، ئەو کەسەی لە بابەتی فەرموودەدا کێشەی هەیە، لە چەندین بابەتی تریشدا کێشەی هەیە، وەك بواری حەددەکان و دەقەکانی تایبەت بە غەیب و موعجیزەکان و سزای ناوگۆڕ و شتی تر.

هەرکەس بابەتی بەبەڵگەبوونی فەرمووده بە چاکی تێبگات و بتوانێت وردەکارانە وەڵامی گومانەکانی سەر فەرمووده بداتەوە، ئینجا پەیوەندی نێوان عەقڵ و نەقڵ و زانستی ئەزموونی و نەقڵ بەجوانی تێبگات، ئەوە کۆی وەڵامدانەوەکانی بەرامبەر ڕێژەیەکی زۆری گومانە ورووژێنراوەکان لەسەر بنەما چەسپاوەکانی شەریعەت وەرگرتووە.

کێشەو گومانە ورووژێنراوەکان لەسەر بەبەڵگەبوونی فەرمووده دەگەڕێتەوە بۆ شەش خاڵ:

## یەکەم: بنەڕەتی بەبەڵگەبوونی فەرموودەو دەستلێبەردانی بەبیانووی ئەوەی تەنها قورئان بەسە:

گومانسازانی سەر سوننەت، بۆ بێمنەتبوونیان لە فەرمووده بە بیانووی ئەوەی تەنها قورئان بەسە، بۆ ئەم بیرکردنەوەیان چەند ئایەتێکی قورئان بە بەڵگە دەهێننەوە، لەوانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ﴾،[1] (لەم کتێبەدا کەمتەرخەمیمان نەکردووە لە هیچ شتێکدا و هەموویمان باسکردووە).

دەڵێن: بەڵگەی لەم ئایەتە ڕوونترتان دەوێت بۆ ئەوەی تێبگەن لەدوای قورئان هیچ پێویست بە فەرمووده ناکات.

وەڵام: مەبەست بە کتێب لێرەدا بریتیە لە لەوحولمەحفووز نەوەك قورئان، بە بەڵگەی دەقی هەمان ئایەت کە دەفەرموێت ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾، (هیچ ئاژەڵێك نیە بەسەر زەویدا بڕوات، یان باڵندەیەك بە دوو باڵەکانی بفڕێت، ئیلا هەموویان وەك ئێوە ئوممەتن و زیکر و یادی خوا ئەکەن، لەم کتێبەدا کەمتەرخەمیمان نەکردووە لە هیچ شتێکدا و هەموویمان باسکردووە، پاشان هەموو ئەوانە ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا). ئەمە وەك فەرمایشتی خوا وایە کە

---

(١) - الأنعام: ٣٨.

دەفەرموێت ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا كُلٌّ فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾،[١] (هەر ئاژەڵێك بەسەر زەویدا بڕوات، ئەوە ڕۆزییان لەسەر خوایە و خوای گەورە زانا و ئاگادارە بە شوێنی نیشتەجێبوون و ئەو شوێنەش كە بۆی دەگەڕێنەوە، هەموو ئەمانە لە كتێبێكی ئاشكار و ڕووندا تۆماركراوە).

جا ڕۆزی و مانەوەو ڕۆیشتنی هەموو گیاندارێك لە لەوحولمەحفووزدایە نەوەك لە قورئاندا.

با وا دابنێین مەبەست بە كتێب لێرەدا قورئانە، هێشتا هیچ دیوێكی ئەو ئایەتە بەڵگەی ئەوە نیشان نادات كە بەبەڵگەبوونی فەرموودە لەكاربخات، لەكاتی قسەكردن لەسەر بەڵگەی دووەمیان، ئەمەش ڕوون دەكەینەوە.

**بەڵگەی دووەم:** خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ﴾، (ئەم كتێبە -قورئان- مان بۆ دابەزاندویت بۆ ئەوەی ببێتە ڕوونكەرەوەی هەموو شتێك).

دەڵێن: مادەم قورئان ڕوونكردنەوەی هەموو شتێكی تێدایە، ئیتر چ پێویستیەكمان بە فەرموودە هەیە؟

وەڵام: بەشێك لە ڕێنموونی قورئان بریتیە لە ڕێنموونی خەڵك بەرەو شوێنكەوتنی پێغەمبەر ﷺ و هۆشیداریدان لە لادان لە فەرمان و ڕێنمایی پێغەمبەرﷺ، ئەمەش لە دەیان شوێنی ناو قورئاندا هاتووە، دەقی وا هەیە گشتگیرە و ناتوانرێت وەك دەقی تایبەت مامەڵەی لەگەڵ بكرێت، بۆیە لادان لە فەرمایشت و ڕێنمایی پێغەمبەری خوا ﷺ، لادانە لە قورئانی پیرۆز.

بەیزاوی لە تەفسیرەكەیدا سەبارەت بەم ئایەتەی كە دەیكەنە بەڵگە (لكل شيء) دەڵێت: هەموو كاروبارێكی دین بە درێژە و وردەكاریەكەیەوە، ئاڕاستەی لای سوننە یان قیاس دەكات).[٢]

---

(١) - هود: ٦.

(٢) - أنوار التنزيل و أسرار التأويل للبيضاوي (٣/٢٣٧).

ئالووسی لە روح المعانی و لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (ئەوەی کە قورئان روونکردنەوە بێت (الکتاب تبیانا) واتە دەقی لەسەر هەندێ بابەت هەیە و هەندێکی دیکەش ئاراستەی لای فەرموودە دەکات کاتێك فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، لەوبارەوە ئەم ئایەتە کراوە بە بەڵگە (وما ینطق عن الهوی)، هەروەها هاندانیشی تێدایە بۆ ئیجماع وەك دەفەرموێت (ویتبع غیر سبیل المؤمنین).[(١)]

شەوکانی لە فتح القدیر دا دەڵێت (واتای ئەوەی روونکەرەوەی هەموو شتێکە (تبیانا لکل شيء) ئەوەیە کە روونکردنەوەی زۆرێك لە حوکمەکانی تێدایە و ئەوەشی دەمێنێتەوە، ئاراستەی لای فەرموودەی دەکات).[(٢)]

**بەڵگەی سێیەم:** خوای گەورە دەفەرموێت (أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا)،[(٣)] (ئایا ئەتانەوێت جگە لە خوا کەسێکی تر بکەم بە حەکەم و دادوەر؟)، دەڵێن: ئێوە بە شوێنکەوتنی سوننەت جگە لەخواتان هەڵبژاردووە بۆ حوکم و بڕیاردان، ئەمەش شیرکە، بۆیە زۆرێکیان ئەهلی سوننە بە بێباوەڕ و موشریك ناودەبەن، تەنها لەبەرئەوەی شوێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کەوتون، لێرەدا باسی خەیاڵ و ئەفسانە ناکەم، بەڵکو باسی واقعێکی راستەقینەتان بۆ دەکەم کە یەکێکە لە سەرسوڕهێنەرترینی ئەو شتانەی خەڵك دەیانبینێت!

قورئانییەکان کە نکوڵی لە هەموو سوننە دەکەن، سەرسوڕهێنەرترین و بیرتەسکترین و کەمعەقڵترین کەسانن، هەرچەندە حەزناکەم بەم چەشنە نەیارانم بدوێنم، بەڵام شتی زۆر نامۆم لێ دیون، بڕێك قەناعەت و بیرکردنەوەی نائاساییان هەیە! تەنانەت هەیانە داوای موباهەلەی[(٤)] لێکردوم لەکاتێکدا یەکێکە لە نەفامترین کەسەکان، بەهەرحاڵ ئەم گومانەیان کە ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە دژ بە فەرموودە، لە چەند روویەکەوە وەڵامی دەدرێتەوە:

---

(١) - روح المعاني للآلوسی (٢١٤/١٤).

(٢) - فتح القدیر للشوکاني (١٨٧/٣).

(٣) - الأنعام: ١١٤.

(٤) موباهەلە ئەوەیە دوو کەس، یان دەستە، بەرامبەر یەك بوەستن و هەردوولا ئامادەبن نەفرینی خوا لە خۆیان بکەن ئەگەر لەسەر حەق و ڕاستی نەبن.

**یەکەم:** خوای گەورە لە قورئاندا راشکاوانە رێنموونی کردوین برێك دادوەر هەبن لەنێو خەڵکدا بە دادپەروەری حوکم و بڕیار بدەن، لەوانە، خوای گەورە دەفەرموێت (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا)،[1] (ئەگەر ترستان هەبوو لە ناکۆکی و دووبەرەکی نێوانیان، ئەوە دادوەرێك لە تەرەفی پیاوەکە و دادوەرێکیش لە تەرەفی ژنەکە بنێرن بۆ صوڵح و رێککەوتن)، ئەگەر تێبینی بکەین (حکما) بە هەمان پێکهاتە و دەربڕین هاتووە کە لە ئایەتی پێشوودا ئەوان دەیانکردە بەڵگە دژ بە فەرموودە!

هەروەها لە قورئاندا رێنموونی هاتووە سەبارەت بە دانانی برێك دادوەر (يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ)، (دوو کەسی دادگەری زاناشتان بڕیاری لەسەر بدەن) هەروەها (وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ)، (ئەگەر لەنێو خەڵکدا داوەریتان کرد، دادپەروەرانە داوەریی بکەن).

ئەگەر خوای گەورە رێنموونیمان بکات لە کێشەی خێزانیدا کەسێك لە ئوممەتی موحەممەد ﷺ بکەینە (حکما) داوەر، ئایا دەکرێت شوێنکەوتنی خودی پێغەمبەر ﷺ لە فەرمان و رێگرییەکانیدا شیرك و هاوەڵ بڕیاردان بێت بۆ خوا؟! ئەمە چ جۆرە داوەرییەکە دەیکەن؟

**دووەم:** گوێڕایەڵیی پێغەمبەر ﷺ گوێڕایەڵیی خوایە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت (مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ)، خوای گەورە لە قورئاندا راشکاوانە ناکۆکیەکانی گێڕاوەتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەتا داوەریشی تێدا بکات، وەك دەفەرموێت (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ)، (ئەگەر لە شتێکدا ناکۆکیتان هەبوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر ﷺ)، هەروەها (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ)، (نا، سوێند بە پەروەردگارت ئیمانیان دانەمەزراوە هەتا داوەریی و بڕیاردان نەدەنەوە دەست تۆ لەو کێشە و ناکۆکیەی لەنێوانیاندا روودەدات).

---

(١) - النساء: ٣٥.

**سێیەم:** مەبەست بە ئایەتەکە (أَفَغَيْرَ اللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا) ئەوەیە کە ئیبن کەسیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت (واتە لەنێوان من و ئێوەدا).

ئیبن عاشوور دەڵێت: مەبەست ئەوەیە جگە لە خوا داوای داوەرێك ناکەم لەنێوان من و ئێوەدا، خوایەك کە بڕیاری ئەوەی لەسەر داون ئێوە دوژمنی تاوانبارن)، ڕاڤەکارانی تریش هەمان قسەی ئەم دوانەیان هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی درێژە بە بابەتەکە نەدەم، بۆیە وتەی ئەوانی دیکەشم نەهێناوە.

ئەمەی پێشوو، وەڵامی دیارترین بەڵگەکانیان بوو، ئێستا پاش ئەوەی گومانەکان ڕەوینەوە، بۆ بەرزکردنەوەی بیناکەمان، بەڵگەکانی تایبەت بە بەڵگەبوونی فەرموودە دەهێنینەوە، دیوەکانی سەلماندنی بەبەڵگەبوونی فەرموودەش لە قورئان و سوننەت و ئیجماع و کاری دەستاودەست و بەردەوامی موسڵمانان لە هەموو سەردەمەکاندا زۆرن، لێرەدا زۆر بە کورتی، ئاماژە بە گرنگترین بەڵگەکان دەکەم، بە جیاش لە کتێبێکی سەربەخۆدا (أفي السنة شك؟) بە شێوەیەکی فراوانتر ڕوونم کردۆتەوە.

بەڵگەکانی ناو قورئان: چەندین ئایەت هەن کە فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵیی پێغەمبەر ﷺ و لەو کاتەی ناکۆکیەك هەبێت، داوەری بدرێتەوە دەستی، چەند ئایەت ڕێگرییان کردووە لە لادان لە فەرمان و ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ، دیوی بەڵگە لەم ئایەتانەدا ئەوەیە کە وەك چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە قورئان دوێنراون، ئێمەش بە هەمان شێوە بە قورئان دوێنراوین، لەو ئایەتانەش کە دەماندوێنن، ئەوانەن کە فەرمان دەکەن بە گوێڕایەڵیی پێغەمبەر ﷺ، تەنها کاتێك دەتوانین ئەو ئایەتانە پەیڕە بکەین، ئەگەر شوێن ئەو فەرموودانە بکەوین کە سەلماوە صەحیحن، هەروەك شافیعی لە کتێبەکەیدا (جماع العلم) دەڵێت: مەگەر بۆ تۆ، یان هیچ کەسێك پێش تۆ، یان ئەوەی دوای تۆ دێت، ئەوەی پێغەمبەری خوای ﷺ نەدیوە تەنها بە فەرموودەکانی نەبێت، ڕێیەکی دوورگرتن هەیە لە بەجێگەیاندنی فەرزی خوا لە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ؟).

بەڵگەیەکی تری قورئان لەسەر بەبەڵگەبوونی فەرموودە، ئایەتێکی سوورەتی نیسائە (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ)، (ئەگەر لە شتێکدا ڕاجیایی

و دووبەرەكیتان بۆ دروست بوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا)، مەبەست بە (تنازعتم في شيء) هەموو شتێك دەگرێتەوە، (فردوه إلى الله و الرسول) مەبەست بە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا: واتە بۆ كتێبەكەی خوا -ئەمەش بۆ هەموو كەسێك روونە-، گەڕاندنەوەش بۆ لای پێغەمبەر ﷺ: واتە تا خۆی لە ژیاندا بوو، بیگێڕنەوە بۆ لای خوا، دوای وەفاتیشی، بیگێڕنەوە بۆ فەرموودەكانی، ئەهلی عیلم لەسەر ئەمە كۆدەنگن.

ئیبن حەزم رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: بەڵگە لەسەر ئەوەی مەبەست بەو گێڕانەوەیە بۆ قورئان و گێڕانەوەكانی (فەرموودەكانی) پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەوەیە چونكە هەموو ئوممەت كۆدەنگن لەسەرئەوەی پەیامەكە ئاڕاستەی ئێمە و هەر كەسێكی ترە كە بەدیدەهێنرێت و هەر مرۆڤ و جنۆكەیەك كە هەتا رۆژی دوایی گیان لە لەشیدا بێت).[١]

ئیبنولقەییم رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (خەڵكی كۆدەنگن لەسەر ئەوەی گێڕانەوەی بۆ لای خوا، گێڕانەوەیەتی بۆ كتێبەكەی، گێڕانەوەش بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گێڕانەوەیەتی بۆ لای خۆی لە ژیانیدا و بۆ لای فەرموودەكانی لە دوای وەفاتی).[٢]

سەبارەت بە بەڵگەی خودی فەرموودە بۆ بەبەڵگەبوونی فەرموودە، ئەم بەڵگە بۆ كەسێك سوودی هەیە كە بەشێك لە فەرموودەی قبووڵە و واز لە بەشێكی تری دەهێنێت و لەو نێوەندەدا هەڵوێستێكی یەكلاكەرەوەی نیە لەسەر فەرموودە، بەڵام ئەو كەسەی بە تەواوەتی نكووڵیی لێ دەكات، سوود لەم بەڵگانە وەرناگرێت، مەگەر ئەوەی هەركات بیەوێت گێڕانەوەیەك لە بەڵگە بهێنێتەوە لە دژمان، پێی بڵێین: بە بەشێك لەوەی بڕوامان پێیەتی بەڵگەمان بۆ مەهێنەرەوە، بەڵكو بە هەمووی.

دەقە صەحیحەكان سەبارەت بە سەلماندنی بەبەڵگەبوونی فەرموودە زۆرن، لەوانە:

---

(١) - الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم (١/٩٧).

(٢) - إعلام الموقعين لابن القيم (٢/٩٢)

ئەو فەرموودەی كە چەند كەسێك لە ئەصحابوسونەن لە ڕێگەی عوبەیدوڵای كوڕی ئەبی ڕافیعەوە لە باوكیەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناویانە كە دەفەرموێت (لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الْأَمْرُ مِنْ أَمْرِي مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ ، فَيَقُولُ : لَا نَدْرِي مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللهِ اتَّبَعْنَاهُ)،[١] (نامەوێ بگەم بە یەكێكتان لەسەر سەرینەكەی پاڵ بداتەوەو كاروبارێكی گرنگی دین بێنن بۆ لای من كە فەرمانم پێ كردووە یان قەدەغەم كردووە، ئینجا بڵێت: نازانین، هەر شتێك لە قورئاندا هەبێت شوێنی دەكەوین و كاری پێ دەكەین -واتە تەنها كار بە شتێك دەكەین لە قورئاندا هاتبێت).

ئەم فەرموودەیە سەنەدەكەی صەحیحە، دەقەكەش لە بابەتێكدایە كە بەڵگەی ئەوەیە واجبە هەرچیەك زیاد لە قورئان، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە، پەسەند بكرێت.

پێشەوا ئەحمەد لە ڕوویەكی ترەوە لە مەسنەدەكەیدا گێڕانەوەیەك لە فەرموودەكەی میقدام لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەهێنێت (أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ ، أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْقُرْآنَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ ، أَلَا يُوشِكُ رَجُلٌ يَنْثَنِي شَبْعَانًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ : عَلَيْكُمْ بِالْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلَالٍ فَأَحِلُّوهُ ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ)،[٢] (چاك بزانن، من كتێب -قورئان- و لەگەڵیشیدا هاوشێوەیم پێ دراوە، من قورئان و لەگەڵیشیدا هاوشێوەیم پێ دراوە، خەریكە بگاتە سەردەمێك پیاوێك ببینن بە سكی تێرەوە لە شوێنی خۆیدا پاڵی دابێتەوە و بڵێت: خوو بدەنە قورئان، هەرچیەكتان تێدا بینی حەڵاڵ بوو، بە حەڵاڵی بزانن، هەرچیەكیشتان تێدا بینی حەرام بوو، ئێوەش بە حەرامی بزانن).

سەبارەت بە بەڵگەی ئیجماع لەسەر بەبەڵگەبوونی فەرموودە:

ئیجماع لەسەر بەبەڵگەبوونی فەرموودە زۆرە، ئیجماعی كرداریی ڕوون لەم بابەتەدا، مەبەستم ئەوەیە زانایان فەرموودەیان بە بەڵگە گرتووەو كاریان پێكردووە، بۆ ئەمەش تەنها دوو نموونە دەهێنمەوە:

---

(١) - سنن الترمذي، الرقم ٢٦٦٣، سنن أبي داود، الرقم ٤٦٠٥، سنن ابن ماجة، الرقم ١٣.

(٢) - أخرجه الإمام أحمد في مسنده (١٣١/٤)، و إسناده لا بأس به.

**یەکەم:** سەبارەت بە فەرمایشتی خوا (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ)، (ئەگەر لە شتێکدا راجیایی و دووبەرەکیتان بۆ دروست بوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا ئەگەر ئێوە بڕواتان هەیە بە خوا و رۆژی دوایی)، پێشەوا عەبدولعەزیزی کینانی دەڵێت: ئەمە لەنێو باوەڕداران و زانایاندا هیچ راجیاییەکی لەسەر نیە کە ئەگەر بیگێڕینەوە بۆ لای خوا، واتە بیگێڕینەوە بۆ کتێبەکەی، ئەگەریش بیگێڕینەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی لە دوای مردنی، ئەوە بریتیە لە فەرموودەکانی، تەنها مولحیدەکان گومانیان لەمەدا هەیە).[1]

**دووەم:** ئیبن عەبدولبەری قورتوبی مالیکی رەحمەتی خوای لێ بێت، لە پێشەکی التمهيد دا دەڵێت (زانایانی بواری فیقهـ و ئەسەر لە هەموو شوێنەکان -هێندەی بزانم- کۆدەنگن لەسەر قبووڵکردنی گێڕانەوەی کەسی دادپەروەر و واجبێتی ئیش پێکردنی ئەگەر هاتو سەلما و ئەسەر یان ئیجماع نەسخی نەکردبوویەوە، هەموو فیقهناسانی هەر سەردەمێك لەسەر ئەم بڕوایەن، هەر لە هاوەڵانەوە هەتا ئەمرۆمان، جگە لە خەواریج و دەستەیەك لە بیدعەکاران کە کەمینەیەك و هی ئەوە نین رایان بە خیلاف وەربگیرێت)،[2] ئەمەش کۆدەنگییە لەسەر بەبەڵگەبوونی خەبەری ئاحاد چ جای موتەواتیر.

## دووەم: لەو گومانانەی بەرامبەر بە فەرموودە دەورووژێنرێن: گومانخستنە سەر بەبەڵگەبوونی فەرموودە ئاحادەکان:

سەرەتا ئەوەتان بیردەخەمەوە کە خەبەری ئاحاد — لەرووی زانستی فەرموودەوە - تەنها لە گێڕانەوەی یەك کەسدا سنووردار نەبووە، بەڵکو لەخوار تەواتورەوە ئیتر ئاحادە، واتە خەبەری یەك و دوو و سێ و زیاتر، هەموو ئەمانە بە خەبەری ئاحاد هەژمار دەکرێت مادەم نەگاتە ئاستی تەواتور.

---

(١) - الحيدة والإعتذار، ص ٦٩.

(٢) - التمهيد لابن عبدالبر (٢/١).

دیارترین ئەو گومانانەی لەسەر بەبەڵگەبوونی خەبەری ئاحاد دەورووژێنرێن، دوانن، دووەمیان لەسەر یەكەمیان وەستاوە:

**یەكەم:** بە رەها بوترێت خەبەری ئاحاد تەنها ئەگەر دەگەیەنێت.

**دووەم:** بانگەشەی ئەوەی هەموو ئەگەرێك سەركۆنەكراوە.

بەم جۆرە بەڵگەكەیان دادەڕێژنەوە: خەبەری ئاحاد ئەگەر دەبەخشێت، هەموو ئەگەرێكیش لە قورئاندا سەركۆنەكراوە، بۆیە وەرگرتنی خەبەری ئاحاد مەسەلەیەكی سەركۆنەكراوە لە قورئاندا.

وەڵامی ئەم بەڵگەش بە پووچەڵكردنەوەی یەكێك لە دوو پێشەكیەكەیە، ئەگەر ئەوەی سەبارەت بە پووچەڵكردنەوەی هەردوو پێشەكیەكە نووسراوە قەناعەتی پێ نەكردیت، ئەوە بەسە كە ئەگەر تەنها یەك دانەیان پووچەڵ ببێتەوە، هەتا نادروستی ئەنجامەكە بێتەدی، پێیشم وایە ئەم شتە بەدەستهاتووە.

سەبارەت بە پێشەكی یەكەم (خەبەری ئاحاد تەنها گومان و ئەگەر دەگەیەنێت) لە رووی شەرع و واقعیشەوە دروست نیە.

لەرووی شەرعەوە لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گێڕانەوەی ئاحادی هاوەڵانی كە دەیناردن بۆ لای ئومەتان، بەڵگەی لەسەر ئەو خەڵكە دەچەسپاند، ئەمەش ئەگەری هەر گومانێك ناهێڵێتەوە.

لە رووی واقعیشەوە، لەبەرئەوەی هەموومان (هاوڕا و نەیار) زۆرجار لەسەر بنەمای هەواڵێكی ئاحاد كە نەگەیشتۆتە ئاستی تەواتور، لە زۆر شتدا دڵنیاییمان دەستدەكەوێت، نموونەش لەو بارەوە لە ژماردن نایەت، وەك هەواڵی هاوسەرگیری و مردن و لەدایكبوون و سەركەوتن و شكست و بردنەوەو دۆڕاندن و.. هتد، خێرا بەو هەواڵانە دەگەینە دڵنیایی، دەی ئەمە بەسە هەتا ئەو بنەمایە پووچەڵ ببێتەوە كە دەڵێت خەبەری ئاحاد ئەگەر و گومان دەبەخشێت.

ئەو خەبەرە ئاحادە صەحیحانەی كە لە فەرمووددا هەن، هەیانە دڵنیایی دەبەخشێت، هەشیانە گومان و ئەگەری راجیح دەبەخشێت، ئەمەش بەپێی بارودۆخ و كەسێتی گێڕەرەوەو سەنەد و قەرائینەكانی هەر گێڕانەوەیەك.

سەبارەت بە پێشەکی دووەمیش (شوێنکەوتنی گومان و ئەگەر لە قورئاندا سەرکۆنەکراوە) ئەم گشتگیرکردنەش ڕاست نیە، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا لە هەندێ شوێندا سەرکۆنەی (ظن) گومان کراوەو لە هەندێ شوێنیشدا وەسف و پیاهەڵدان، سەبارەت بە سەرکۆنە، خوا دەفەرموێت (إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا)،[1] (تەنها شوێنی گومان دەکەون، گومانیش هیچ سوودێکی نیە و جێگای حەق ناگرێتەوە)، سەبارەت بە وەسف و بەچاك باسکردنیشی، خوای گەورە دەفەرموێت (الْخَاشِعِينَ، الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُمْ مُلَاقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ)،[2] (ئەو لەخواترسانەی کە دڵنیان دەگەنەوە بە پەروەردگاریان و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا)، مەبەست بە (ظن) لەم ئایەتەدا دڵنیاییە، ئەگەرنا گومانەکەیان چ سوودێکی پێ دەبەخشین ئەگەر کاتی گەیشتنەوە بە پەروەردگاریان کەمترین ڕێژەی گومان و دوودڵییان هەبوایە؟ قورتوبی[3] لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێت: (بە ڕای جمهور (ظن) لێرەدا واتای دڵنیایی دەبەخشێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت (إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ)، (من دڵنیا بووم دەگەمەوە بەم ڕۆژی لێپێچینەوەو ئەنجامەم)، هەروەها دەفەرموێت (فَظَنُّوا أَنَّهُمْ مُوَاقِعُوهَا).

پێشەوا شنقیتی پاش ئەوەی باسی ژمارەیەك ئایەتی قورئانیی دەکات کە تیایدا باسی (ظن) بە واتای دڵنیایی هاتووە، ئینجا دەڵێت (لە هەموو ئەم ئایەتانەدا (ظن) بە واتای دڵنیایی دێت، عەرەبیش (ظن) یان بۆ دڵنیایی و بۆ گومانیش بەکارهێناوە).[4]

بەراوردی ئەو گومانەی لە خەبەری صەحیحی ئاحادا هەیە بە گومانی سەرکۆنەکراوی بێباوەڕان کە لە قورئاندا هاتووە، بەراوردێکی هەڵەیە و گومان لە هەڵەکەشیدا نیە، شێخ ئیبن عوسەیمین ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە تەفسیری ئایەتی نەجمدا (إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا) دەڵێت: (مەبەست بە (ظن) لێرەدا، وەهمی درۆیە نەوەك ئەگەر باشتری نێو دوو ئەگەر،

---

(١) - النجم: ٢٨.

(٢) - البقرة: ٤٥-٤٦.

(٣) - تفسير القرطبي، ط الرسالة (٧٢/٢).

(٤) - أضواء البيان نشر مكتبة ابن تيمية (١٤١/١-١٤٢).

وریای ئەوە بە، گومان بە واتای تۆمەتیش دێت، بە واتای هەڵبژاردن و بە باشتر دانانی شتێکیش دێت، بە واتای دڵنیاییش دێت).[١]

هەروەها خوای گەورە لە کتێبەکەیدا وەرگرتنی شایەتیی شایەتیدەرانی داناوە، ئەوانیش ئاحادن، یان دەبێت نەیارانی خەبەری ئاحاد بڵێن شایەتیەکەیان دڵنیایی دەبەخشێت کە ئەمەش پێچەوانەی پێشەکیی یەکەمیانە، یاخود دەبێت بڵێن ئەو شایەتییە گومان دەبەخشێت هەرچەندە وەك شەرع دانراوە، ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی پێشەکیی دووەمە، هەرچیەك سەلما تەشریعی خوایە، شتێکی سەرکۆنەکراو نیە.

ئیبن حەزم رەحمەتی خوای لێ بێت، دەڵێت: (ئیجماعی هەموو ئوممەت لەسەر ئەوەیە کە خەبەری ئاحادی جێمتمانە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەردەگیرێت، هەروەها هەموو موسڵمانان لەسەرئەوە کۆك بون کە گێڕانەوەی تاکیش وەربگرن).[٢]

لە کتێبەکەمدا (أفي السنة شك؟) چەند دیوێکی تری وەڵامدانەوەی گومانسازانی سەر بەڵگەداریێتی فەرموودەی ئاحادم باسکردووە.

## گومانی سێیەم: سەبارەت بەوانەی فەرموودەیان نەقڵ کردووە و گێڕاوەتەوە:

گومانسازان دەڵێن: فەرموودە لە رێی کەسانێکی متمانەپێنەکراو و دوور لە سپاردەکارییەوە بۆ ئێمە گوازراوەتەوە، بەڵگەشیان بۆ ئەوە گێڕانەوەی هەندێ لادانی شەرعی ژمارەیەك لە گێڕەرەوانی فەرموودەیە.

وەڵامدانەوەی ئەم گومانەش لە چەند روویەکەوە دەبێت:

**یەکەم:** زانستی جەرح و تەعدیل سەبارەت بە تانەدان لە گێڕەرەوەکان، مافی هەر شتێکی داوە لە ئاستی خۆیدا، تانەی وا هەیە کار دەکاتە سەر گێڕانەوەکە، هەیانە کار ناکات، بەڵام مامەڵەی سەرپێیی لەگەڵ گێڕەرەوە بەبێ جیاکردنەوەی ئەو تانانەی کە کاریگەرییان هەیە لەسەر گێڕانەوەکەو ئەوانەی کاریگەرییان دانەناوە، هەڵەیە.

---

(١) - لقاء الباب المفتوح رقم (٧١).

(٢) - الإحكام في أصول الأحكام لابن حزم (١/١١٣-١١٤).

**دووەم:** زۆربەی ئەو گێڕانەوانەی بەهۆیانەوە تانە دەدەن لە هاوەڵان، یاخود گێڕەرەوانی فەرموودە، لە رووی سەنەدەوە نەسەلمێنراون، وەك تانەدان لە ئەبووهورەیرە بەوەی لەپێناو خواردندا بەردەوام نووساوە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ نارەحەت بووە بەو هەموو هاودەمییەی ئەبووهورەیرە لەپێناو خواردندا، بۆیە پێی فەرمووە (یا أباهر، زر غبا تزدد حبا)،[1] (ئەی ئەباهیر، سەردانت کەم بکەرەوە، خۆشەویستیت زیاد دەکات)، جا پەیوەست کردنی (سەردانت کەم بکەرەوە) ببەسترێتەوە بە مەسەلەی خواردنەوە، شتێکی نادروستە، بەڵکو خودی فەرموودەکە لە بنەڕەتدا نەسەلماوە کە صەحیح بێت، بەزار دەڵێت: نەزانراوە (زر غبا تزدد حبا) فەرموودەیەکی صەحیح بێت،[2] عوقەیلیش دەڵێت لەو بابەتەدا فەرموودەیەك نەهاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ و سەلمابێت.[3]

**سێیەم:** زانستی جەرح تەعدیل کێشانەیە لەو بابەتەدا، لە وردەکاریی مرۆییشدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی، زۆرێك لەوانەی تانە دەدەن لە زانستی فەرموودە، گرنگیی ئەو زانستە نازانن و ئاگادار نین فەرموودەناسان چ وردەکارییەکیان تێدا کردووە، فەرموودەناسان برێك بنەمای مەوزووعییان لە بواری جەرح و تەعدیلدا داناوە و بەسەر دۆست و نەیاری ناو مەزهەبە فیقهی و بیروباوەڕییەکانیشدا جێبەجێیان کردووە، بۆیە دەبینیت لە دوو کتێبەکەی بوخاری و موسلیمدا، گێڕەرەوەی سەر بە مەزهەبە جیاوازە بیروباوەڕییەکانی وەك گێڕەرەوەی سوننی و شیعی و ناصیبی و قەدەری و خاریجی هەیە، بەو مەرجەی دادپەروەری و راستگۆیی ئەو کەسە سەلمابێت، هەرکەسیش دادپەروەریەکەی نەسەلمابێت، فەرموودەیان لێوەی نەهێناوە، ئیتر سوننە بووبێت یان نا.

---

(١) - مسند الطيالسي (٦٢٨٥).

(٢) - كشف الأستار للهيثمي (٣٩٠/٢)

(٣) - الضعفاء الكبير للعقيلي (١٣٨/٢-١٣٩).

## گومانی چوارەم: ڕێگریی لە نووسینەوەی فەرمووده و ئەوەی پەیوەستە بە ڕێکەوتی نووسینەوەی و تۆمارکردنی:

سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە نووسینەوەی فەرموودەوە، خەڵکانێك پشت دەبەستن بە فەرموودەیەك کە لەو بارەوە هاتووە، کەچی خۆیان دەکەونە نێو گێژاو و دوو فاقیەوە، خراپی پشتبەستنەکەیان لە چوار ڕووەوەیە:

**یەکەم:** فەرموودەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لە کاتێکدا خۆیان پێیان وایە فەرمووده بە بەڵگە ناگیرێت.

**دووەم:** ئەو پێغەمبەرەی کە ڕێگریی کرد لە نووسینەوەی فەرمووده، هەر ئەویش بوو فەرمانی کرد بە لەبەرکردنی و گەیاندنی و ڕێگریی کرد لە بەرپەرچدانەوەی، سەنەدی صەحیحیش لەوبارەوە زۆرە، بەڵکو زۆر صەحیحترن لە فەرموودەکەی ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرمووده، ئەی ئەم جۆرە هەڵوێستە بۆچی؟ ئایا بڕوایان بە فەرموودەیەکە کە لەگەڵ حەز و ئارەزوویاندا بگونجێت، ئەگەر نەگونجێت، ئیدی بەرپەرچی دەدەنەوە؟!

**سێیەم:** وەك چۆن فەرمووده لەبارەی ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرمووده هاتووە، لە چەندین فەرموودەشدا هاتووە کە دەرفەتی نووسینەوەی دراوە، لەوانە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کاتێك وەڵامی داواکاری ئەبوشاتی دایەوە بۆ نووسینەوەی وتارەکەی، فەرمووی (اكتبوا لأبي شاة).[1] یان عەبدوڵامی کوڕی عەمر فەرموودەی دەنووسیەوەو پێغەمبەری خوایش ﷺ پشتیوانی دەکرد و دەیفەرموو (**اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلَّا حَقٌّ**)،[2] (بینووسەرەوە، چونکە سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە، دەمم جگە لە حەق، هیچی تری لێوە دەرناچێت).

دەی لەسەر چ بنەمایەك نکووڵیکارانی سوننەت فەرموودەی ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرمووده هەڵدەبژێرن و فەرموودەی مۆڵەتدان بە نووسینەوەی فەرمووده لەکاردەخەن؟

---

(١) - صحيح مسلم باختصار، ٣٥٥.

(٢) - سنن أبوداود، الرقم ٣٦٤٨.

**چوارەم:** لێرەدا کەلێنێك هەیە لە پشتبەستن بە فەرموودەی نووسینەوەی فەرموودە بۆ ئەوەی بیکەن بە بەڵگە لەسەر بەبەڵگەنەگرتنی فەرموودە، چونکە بۆچوونی ڕاست سەبارەت بەو فەرموودەیە ئەوەیە کە سنووری دەقەکە تێنەپەڕێنرێت، ئەویش ڕێگریکردنە لە نووسینەوەی، نەوەك ڕێگریکردن لە بەبەڵگەگرتنی، چونکە دەقەکە بە دوورو نزیك، هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە سەبارەت بە بەڵگەنەگرتنی فەرموودە، بەڵکو لە خودی ئەو فەرموودەدا فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە دەفەرموێت (وحدثوا عني)،[1] (فەرموودەم لێوە بگێڕنەوە).

پاشان، زانایانێك هەن کە دەڵێن: ڕێگریکردن لە نووسینەوەی فەرموودە بەو چەشنە صەحیح نیە کە درابێتەوە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە قسەکەی هی خودی ئەبووسەعیدی خودرییە، ئەمەش ڕێڕەوی پێشەوا بوخارییە و ئیبن حەجەریش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە (فتح الباري) دا باسی ئەوەی کردووە،[2] ئیبن عەبدولبەریش لە (جامع بيان العلم و فضله) دا هەندێ ڕێی ئەو مەوقووفەی باسکردووە.[3]

هەندێك لە زانایانیش فەرموودەکەیان بە چەسپاو داناوە، بەڵام پێیان وایە بە فەرموودەی مۆڵەتدانی نووسینەوەی فەرموودە نەسخ بووەتەوە، چەند تێڕوانینی تریش هەن کە ئەگەر بیانهێنین، زۆر درێژە دەکێشێت.

هەندێك سەرچاوە لەم بوارەدا:

١- کتێبی (تقييد العلم) لە نووسینی خەتیبی بەغدادی.

٢- کتێبی (تدوين الحديث) لە نووسینی مناظر الكيلاني کە بە زمانی ئوردوو نووسراوەو وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبی و دار الغرب چاپیان کردووە.

---

(١) - صحيح مسلم، الرقم ٣٠٠٤.

(٢) - (٢٠٨/١).

(٣) - (٢٦٨/١).

٣- کتێبی (دراسات في الحديث النبوي و تأريخ تدوينه) لە نووسنی موحەممەد موستەفا ئەعزەمی.

٤- کتێبی (السنة قبل التدوين) لە نووسینی موحەممەد عجاج خەتیب.

٥- کتێبی (تدوين السنة النبوية) لە نووسینی موحەممەد مەتەر زەهرانی.

سەبارەت بە دواکەوتنی تۆمارکردنی فەرموودەش، ئەو گومانەی لەم بوارەدا دەورووژێنرێت، لەسەر تێڕوانینێکی کورت بۆ ڕێوشوێنی جێگیرکردنی فەرموودە دامەزراوە، بۆیە وەڵامی پێویست بۆ ئەو گرفتە، بەوە دەبێت بە وردیی مێژووی جێگیرکردنی فەرموودە و ڕێوشوێنی گێڕانەوەو گواستنەوەی بخرێتەڕوو، هەتا کەسێك تێڕوانینێکی ورد و تێروتەسەلی لەسەر ئەوە نەبێت، هیچکات لە قایموقۆڵیی گواستنەوەی فەرموودە تێناگات و هەمیشە قسە لەسەر برێك تێڕوانینی ئەندێشەیی دەکات نەك تێڕوانینی واقیعی.

وێڕای ئەوەی، تۆماری فەرموودە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا کاتی تۆماری گشتگیر دانەبڕاوە، لەو کەسانەی گرنگیی داوە بە بەدواداچوونی ئەو پەڕاوانەی لە قۆناغی پێش تۆماری گشتگیری فەرموودەدا نووسراون، دکتۆر موحەممەد موستەفا ئەعزەمی لە کتێبەکەیدا (دراسات في الحديث النبوي و تأريخ تدوينه).

## گومانی پێنجەم: گومان لەسەر زانستی فەرموودەو ڕێبازی فەرموودەناسان:

زۆرێك لەوانەی نکووڵی لە فەرموودە دەکەن، یان گومانی لەسەر دروست دەکەن، دەڵێن: (لەو ڕووەوە نکووڵی لێ ناکەن کە سوننەتە، بەڵکو نکووڵییەکەیان لە متمانە نەبوونە بە ڕێڕەوی گواستنەوەی فەرموودە)، پرسیارێکی گرنگمان هەیە بۆ ئەو جۆرە کەسانە: ئایا لە ڕووی زانستیەوە شتێکی مەحاڵە صەحیح و لاوازی ئەو فەرموودانە جیابکرێنەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێردراونەتەوە؟ لە وەڵامدا کە دەوترێت (بەڵێ) یان (نەخێر) دەبێت لەسەر بنەمای تێڕوانینێکی صەحیحی تەواوەتی بۆ واقیعی گێڕانەوەکە و سەنەد و گێڕەرەوەکان بنیادنرابێت،

پێویستە پاش تێڕوانینێکی تەواوەتی بۆ (زانست)ی پەیوەست بە لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دامەزرابێت، ئەویش بریتیە لە زانستی فەرموودە کە پێناوێکە لەنێو ئەهلی سوننەدا بۆ ناسینی ڕاستی و دروستی گێڕانەوەی فەرموودەکان، کۆدەنگیەك هەیە بۆ پشت پێبەستنی، بەناوبانگترین، یاخود بگرە تاکە زانستێکە بۆ ئەو بوارە، هاوکات لەسەر تێڕاونینی دروستی تەواوەتی بۆ واقیعی گێڕانەوەکان بنیادنراوە.

بەوپەڕی متمانەوە دەڵێم: زۆربەی ئەوانەی گومان دەورووژێنن لە ئاست فەرموودەدا، تێڕوانینێکی واقیعییان نیە سەبارەت بەو دوو بابەتە، نە واقیعی گێڕانەوەو گێڕەرەوەکان، نە ئەو زانستەی پەیوەستە بەو بوارەوە، ئیتر چۆن بڕیاری ئەوە دەدەن کە گواستنەوەی فەرموودە جێمتمانە نیە؟ لەسەر چ بنەڕەتێك ئەمەیان بنیاد ناوە؟!

بۆیە، هەنگاوی یەکەمی بڕیاردان لەسەر زانستی فەرموودە بەبێ دەسترۆیی و لێهاتوویی، واتە تێڕوانینێکی دروست بۆ ئەوە زانستە چەشنی ئەو تێڕوانینەی کە زانایانی ئەو بوارە دایانمەزراندووە، وەك پێشتریش وتمان، ئەمە لای زۆربەی گومانگەراکان نیە.

سەبارەت بە وردەکاریی فەرموودەناسان و ڕێکوپێکی ڕێبازەکەیان، دەتوانرێت لە چەندین ڕووەوە ڕوونبکرێتەوە، هەرکات بگەڕێیەوە بۆ کتێبەکانی فەرموودەناسانی پێشوو و ڕێ و ڕێبازیان، زۆر جوانتر درك دەکەین بە گەورەیی ئەم زانستە.

یەکێك لەو شتانەی دەتوانێت وردەکاری و مەوزووعیبوونی ئەم زانستە نیشان بدات، هەڵوێستەکردنە لە ئاست مەرجەکانی فەرموودەی صەحیح و وردەکارییەکانی، مەرجەکانیش بریتین لە: (ڕێکی و دادپەروەری، بەجوانی لەبەرکردن و وەرگرتن، سەنەدی پەیوەست هەتا کۆتا، پارێزرانی سەنەد و دەق لە شتی نامۆ، پارێزران لە عیللەت).

هەرکەس بە جوانی شارەزیی وەرگرتبێت لە زانستی فەرموودە، ئەوە دەتوانێت لە سایەی هەر مەرجێك لەو پێنج مەرجەدا، بەڵگەی متمانە و تۆندوتۆڵی ئەم

زانستە بە چەشنێك نیشان بدات کە لە هیچ زانستێکی تری مرۆییدا لەمە زیاتری تێنەپەڕاندبێت.

نمـوونـــــە:

ئەگەر باسی مەرجی بەجوانی لەبەرکردن و وەرگرتن بکەین، ئەوەی لە بازنەی ئەم مەرجەدا نیشان دەدرێت، بریتیە لە شێوازی بڕیاردانی فەرموودەناسان لەسەر گێڕەرەوەیەك کە ئایا ئەم مەرجەی تێدایە، ئایا بڕیاردانەکەیان لەسەر گێڕەرەوەیەك بەوەی ئەم مەرجەی تێدایە، واتای ئەوەیە هەرچییەکی گێڕایەوە صەحیحە؟ یان دەکرێت هەڵەش بکات؟ ئەگەر هەڵەی کردبێت، چۆن هەڵەکەی ئاشکرا دەکرێت لەکاتێکدا بڕیاری ئەوەمان لەسەرداوە کە دادپەروەرە و لەبەرکردن و وەرگرتنی تەواوە؟ ئایا گێڕەرەوەکان کە ئەم مەرجەیان تێدایە، هەموویان لە یەك ئاستدان بۆ وەرگرتنی فەرموودە لێیانەوە؟ یاخود پلەکانیان جیاوازن؟ سوودی ئەو پلەبەندییە چیە؟ ئایا کاتێك نەگونجانێك لە گێڕانەوەکاندا هەبوو، ئەوەیان زەبتکردنی باشترە، بیخەینە پێش ئەوەی کەمترە؟ حوکمی گێڕەرەوەیەکی ڕاستگۆ چیە کە زۆر شت دەپێکێت و زۆرجاریش هەڵە دەکات؟ فەرموودەناسان کەی فەرموودەی لێ وەردەگرن و کەی لێی وەرناگرن؟ چۆن بزانین ئەو گێڕەرەوەی کە بڕیاری ئەوەمان بۆ داوە زەبتی تەواوە، دوای چەند ساڵێك لەو بڕیارە، لەبەرکردنی نەگۆڕاوە؟ ئەمانە و چەندین وردەکاریی تر کە لەوپەڕی وردەکاری یاساکانی زانستی فەرموودەدا بەدیدەکرێن.

## شەشەم: گومان خستنە سەر چەند فەرموودەیەکی دیاریکراوی صەحیح، بە بیانووی پێکەوە نەگونجانیان:

پرسیار دروستکردن لەسەر کۆمەڵێك گێڕانەوەی صەحیح، شتێکی خراپ نیە ئەگەر لەسەر بنەمای تێگەیشتن و هەوڵی نەهێشتنی گومانی پێکەوەنەگونجانیان بێت، چونکە عائیشە و حەفصە و چەندین هاوەڵی تریش کە کێشەیان لەسەر تێگەیشتن لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ بووە، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردووەو ئەویش کێشە و تێنەگەیشتنەکەی بۆ ڕوونکردوونەتەوە، بەڵکو ئەوەی

بەخراپ دەزانرێت، ئەو پشێوییەیە کە لە مامەڵە لەگەڵ ئەو چەشنە گێڕانەوانەدا نیشان دەدرێت و بە نەفام نیشاندانی زانایانی موسڵمانە، یاخود وا نیشان بدرێت قسەکردن لەسەر ئەو فەرمووادانەی وادەزانرێت پێکەوە ناگونجێن، دۆزینەوەو دەستکەوتێکی لەناکاوە بۆ خەڵك، لەکاتێکدا زانایان چەند سەدە لەمەوبەر شرۆڤەی ئەو بابەتانەیان کردووەو دیوی تێنەگەیشتنەکەیان روونکردۆتەوە.

زانایانی موسڵمان گرنگییان داوە بە باسی ناتەبایی نێوان بەڵگەکان یان ناتەبایی نێوان ئایەتەکانی قورئان، یان ناتەبایی نێوان قورئان و فەرموودە، یاوەکو نێوان فەرموودە و فەرموودە، یاخود نێوان فەرموودە و عەقڵ، یان فەرموودە و هەست، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم پرسەش، رێبازێکیان دارِشتووە کە لە بابەتی (ناتەبایی نێوان بەڵگەکان) لە کتێبەکانی ئوصولدا، یان لە باسی (مختلف الحديث) لە نێو کتێبەکانی زانستی فەرموودەدا بەدیدەکەیت.

لە کۆن و نوێیشدا، چەندین کتێبی تایبەت بەم بوارە دانراون کە ئەگەر بمانەوێت باسی هەموویان بکەین، کاتی زۆری دەوێت، تەنها بۆ نموونە و ئاماژە پێدان، ناوی چەند دانەیەکیان دەهێنین:

اختلاف الحديث لە نووسینی شافیعی.

شرح مشكل الآثار لە نووسینی تەحاوی.

تأويل مختلف الحديث لە نووسینی ئیبن قوتەیبە.

لە نووسراوەکانی سەردەمیش:

دفع دعوى المعارض العقلي عن الأحاديث المتعلقة بمسائل الإعتقاد، دراسة لما في الصحيحين لە نووسینی عیسا نعمی.

التعارض في الحديث النبوي لە نووسینی لوتفی زغیر.

أحاديث العقيدة المتوهم إشكالها في الصحيحين لە نووسینی سولەیمان دبیخی.

ASTANA

لە کتێبی (أفي السنة شك) چەند بنەمایەکی مەنهەجیم باسکردووە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو فەرموودانەی کە وادەزانرێت لەگەڵ قورئان و عەقڵ و گێڕانەوەی تری فەرموودە و زانستی فەرموودەدا ناتەبان.

## بەشی دووەم: گومانەکان لەسەر ئیجماع

هەندێ کەس حاڵیان گەیشتۆتە ئەوەی نکوڵی لە بەڵگەداریێتی ئینجماع بکەن و ڕێ بە خۆیان بدەن بڵێن هەموو ئوممەت لە ماوەی چواردە سەدەدا هەڵە بون، ئەم هەڵوێستەش پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای گەورە هەواڵی لەبارەوە داوە ئوممەتی ئیسلامی چاکترینی ئوممەتانە و میانڕەوە هەتا بەهۆی دادپەروەری و ڕاستگۆییەکەیەوە، ببێتە شایەت بەسەر خەڵکەوە، ئیتر چۆن ئەگونجێت ئەو هەموو سەدەیە ببڕێت و لەسەر هەڵە بڕوات و حەق نەناسێت و پەیڕەوی نەکردبێت؟!

تەنانەت بە پێوەری هەڵسەنگاندنی عەقڵیش، ئەمە دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە سەرچاوەی حوکمە شەرعیەکانی قورئان و فەرموودە و ئەو ئیجماعەی لە زانایانەوە گواستراوەتەوە، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتی ناوی دوو وەحی ڕاشکاو و جیا لە ڕاشکاو (صریح و ناصریح)، سەرجەم موجتەهیدەکانیش هاوبەشن لە بنەڕەتی پێناوەکانی هەڵێنجان لە قورئان و سوننەتەوە، با جیاوازیەکی کەسییش هەبێت لە بەدیهێنانی کەماڵ لەو پێناوانەدا، بەڵام کۆی موجتەهیدان، هەموو ئەو ئاستانە لەخۆدەگرێت، پاشان، پێویست دەکات بە ئەنجامێکی دروستەوە لە هەڵێنجان دەرچن ئەگەر بێتو لەسەری یەکدەنگ بوون، مەگەر گونجاوە هەموو موجتەهیدەکان کەوتبنە هەڵەوە لە تێگەیشتنی دەقدا؟ یاخود پاش چواردە سەدە ئینجا ڕووی ڕاست و دروست زانرا؟ بەتایبەت کە ئاستی بەدیهێنانی کەماڵ لای موجتەهیدانی سەرەتا لە پێناوەکانی هەڵێنجاندا، زۆر باڵاترە لە ئاستی موجتەهیدانی دواتر، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەوکات زمانی عەرەبی پارێزراو بووە لەو شێواندنەی کە دواتر تووشی بوو، هەروەها لەبەر بوونی هۆکارێکی گرنگ لە ڕیزی یەکەمی موجتەهیداندا بەتایبەت، مەبەستم ڕیزی هاوەڵانە، ئەویش هۆکاری هاوسەردەمێتی دابەزینی وەحی و هاوەڵێتی ئەو کەسەی قورئانی بۆ دادەبەزی،

بۆیە ئەوان لە هەرکەسی تر تواناییان زیاتر بوو بۆ تێگەیشتن لە دەقەکان، هەرچەندە دەرگای ئیجتیهاد بە رووی خەڵکی تریشدا دانەخراوە، بەڵام دوور لەوەی وا تەماشای هەموان بکرێت کە هەڵە بون، چۆن هەموویان یەکدەنگ دەبن لە هەڵە تێگەیشتندا، بەتایبەت کە کۆمەڵێك هۆکاری دەرەکی کارتێکەر نەبون بۆ تێگەیشتن لە دەق لە زۆرێك لەو بابەتانەی کە لەلایەن هەندێ لە توێژەرانی سەردەمەوە، جیاواز لە ئیجماع قسەیان لەسەر کراوە، بەڵکو ئەوکات تەنها چەند بابەتێکی شەرعیی بیستراو بوون و هیچی تر، وەك حەددی رەجم و سزادانی مورتەد و شتی لەو چەشنە، ئیتر چ بابەتێك بووە کە لای موجتەهیدانی سەرەتا نەبووەو لای توێژەرانی ئەم سەردەمە بەردەستە هەتا ئەوانەی پێشوو هەموویان هەڵە بکەن لە تێگەیشتنی ئایەتەکانی قورئان و سەلماندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام توێژەرانی ئەم سەردەمە پێکابێتیان؟

پێموایە ئەم پرسیارە وادەخوازێت زۆر بە وردی بیری لێ بکەینەوەو لێی رابمێنین، دوور لە کاریگەریی دەستەواژەی (ئەوان پیاو بوون و ئێمەش پیاوین) و (چەند بابەت هەیە کە کەسانی پێشوو جێیان هێشتووە بۆ ئەوانەی دوای خۆیان)، چونکە من لێرەدا باس لە هەڵێنجانی نوێ ناکەم، باسی قووڵبوونەوەی زیاتر لە واتای ئایەتەکانم نەکردووە، بەڵکو باسی بەهەڵە دانانی هەموو ئەوانەی پێشوو دەکەم نەوەك زیادکردنی زانیاریی بۆ سەر زانیارییەکانی ئەوان.

ئەوەی زیاتر ئەو قسەیە دەسەلمێنێت، ئەوەیە کە زۆر بابەت هەن کە نکووڵییان لێ کراوە بە ئیجماعی چەسپاو سەبارەت بەو بابەتانە دراوە بە دیواردا (پشتگوێ خراوە)، ئەوانەی نکووڵییان لێکردووە، لە نکووڵییەکەیاندا بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەو بابەتانە پێچەوانەی دەقی راشکاوی ناو قورئانن، وەك دەڵێن: سزای مورتەد (کەسێك لە ئیسلام هەڵبگەڕێتەوە) بە شێوەیەکی دیار بەریەککەوتنی هەیە لەگەڵ فەرمایشتی خوادا (لا إكراه في الدين)، بڕوا دەکەیت بابەتە هێندە بەم رووکەشییە بێت؟

بابەتێکی تریش هەیە، بریتیە لەوەی هەندێ کەس ئەو قۆناغەی پێشووش تێدەپەڕێنێت و لەوەدا هاوڕایە کە ئوممەتی موسڵمانان لەسەر هەڵە یەکدەنگ

کۆنەبووەتەوە، بەڵکو لەوەدا هاورا نیە کە ئیجماع قبووڵ بکات، ئەمەش بابەتێکی ئوصولییە و وردەکاریی زۆر و قسەی جیاواز لەخۆدەگرێت سەبارەت بە دەستنیشانکردنی ئەو ئیجماعەی کە دەکرێت وەربگیرێت، بەڵام بنەڕەتی ئیجماع پووچەڵ ناکرێتەوە، بۆیە ئەو ئیجماعانەی بۆمان گواستراونەتەوە، لە رووی سەلمان و یەکلابوونەوەیانەوە، ئاستیان جیاوازە.

هەندێك لە گومانسازان دەستەواژەیەکی پێشەوا ئەحمەد دەکەنە بەڵگە بۆ نەهاتنەدی ئیجماع کە دەڵێت (هەرکەس بانگەشەی ئیجماع بکات، ئەوە درۆزنە).[١]

لێرەدا زۆر بە کورتی و بە دەستکارییەوە، پوختەیەکی ئەوە دێنم کە لە کتێبی (کامل الصوره ٢) دا سەبارەت بەم دەستەواژەیە نووسیومە:

(وەرگرتنی ئەم دەستەواژەی پێشەوا ئەحمەد و وەرنەگرتنی دەستەواژە و دەربڕینەکانی تری لەسەر هەمان بابەت، دەقوەرگرتنێکی نامەوزووعی، یان نەزانیەکە لەپای کەمشارەزاییەوە، پێشەوا ئەبووداود لە المسائل دا دەڵێت: بیستم بە ئەحمەد وترا: فلانەکەس دەڵێت: خوێندنی فاتیحەی قورئان -واتە لە پشت پێشنوێژەوە- تایبەتە بەم ئایەتەی دەفەرموێت (وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ) کێ شتی وای وتووە؟ هەموو خەڵکی لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە ئەو ئایەتە لە نوێژدایە).[٢]

ئەمە دەقێکی روون و چەسپاوە لە پێشەوا ئەحمەدەوە کە تیایدا بانگەشەی ئەوە دەکات ئیجماع لەسەر مەسەلەیەکی شەرعی هەیە، ئایا دەکرێت ئەو دەستەواژەی خۆی بەسەردا پەیڕەو بکەین (هەرکەس بانگەشەی ئیجماعی کرد، ئەوە درۆزنە)، یاخود هەوڵ بدەین بەو چەشنە لێی تێبگەین کە لەگەڵ جێبەجێکردنەکانی خۆیدا بگونجێت؟!

بۆچی پشت دەبەسترێت بە یەك دەستەواژە و دەست نابرێت بۆ ئەوانی دی؟ ئەگەر بابەتەکە وەرگرتنی دەرهێنانی دەستەواژە بێت، ئەوە لەوانەیە یەکێك بڵێت:

---

(١) - العدة في أصول الفقه (١٠٥٩/٤).

(٢) - مسائل الإمام أحمد روايه أبی دواد السجستانی، مكتبه ابن تيميه (ص ٤٨).

دەیەوێت دەستەواژەیەك دەربهێنێت كە تیایدا باس لە سەلماندنی ئیجماع دەكات و ئەو دەستەواژەیە لەكاربخات كە تیایدا بانگەشەی ئەوە دەكات ئیجماع درۆیە!

بێگومان ئەو ڕێبازەی كە لای زانایان پەسەندە و لە مامەڵە لەگەڵ دەستەواژەكەی ئەحمەددا گرتوویانەتەبەر، ئەوەیە كە لە سایەی جێبەجێكردنەكانی و قسەكانی تریدا ئاڕاستەی ئەم دەستەواژەی بكەین و لێی تێبگەین، نەوەك بۆ لەكارخستنی ئیجماع پشتی پێ ببەستین، لەوا ئاڕاستەكردانانەی كە زانایان سەبارەت بەو دەربڕینەی پێشەوا ئەحمەد خستوونیانەتەڕوو:

پێشەوا ئەحمەد دژ بە فیقهناسانی موعتەزیلە ئەمەی وتووە، مەرداوی لە (التحبير) دا دەڵێت: ئیبن ڕەجەب لە كۆتایی شەرحی ترمزیدا دەڵێت: ئەو قسەی لە پێشەوا ئەحمەدەوە گێڕدراوەتەوە (هەركەس بانگەشەی ئیجماع بكات، ئەوە درۆ دەكات) ئەمەی لە بەرامبەر فیقهناسانی موعتەزیلەدا وتووە كە بانگەشەی ئەوەیان دەكرد قسەكانیان وەرگیراوی ئیجماعی خەڵكە، لەكاتێكدا خۆیان لە هەموو كەس شارەزاییان كەمتر بوو بە وتەی هاوەڵان و تابعين).[١]

ئەوەی پاڵپشتی ئەم تێگەیشتنە دەكات، تەواوی دەستەواژەكەی خودی پێشەوا ئەحمەدە كە لە گێڕانەوەكەی عەبدوڵای كوڕیدا هاتووە دەڵێت (هەركەسێك بانگەشەی ئیجماع بكات، ئەوە درۆزنە، لەوانەیە خەڵكی ڕاجیا بن، ئەمە بانگەشەی بیشری مریسی و ئەصەممە)،[٢] بیشری مریسی و ئەصەممیش لە سەرگەورەكانی بیدعەكارانی سەردەمی پێشەوا ئەحمەد بوون.

وتەیەكی ئیبن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بابەتەكە ڕوونتر دەكاتەوە (فیقهناسانی ئەهلی كەلام وەك مریسی و ئەصەم، بانگەشەی ئیجماعیان دەكەن، لەكاتێكدا تەنها شارەزای قسەی ئەبووحەنیفە و مالیك و كەسانی وەك ئەوانن و ئاگادار نین بە وتەی هاوەڵان و تابعين).[٣]

---

(١) - التحبير شرح التحرير في أصول الفقه للمرداوي، مكتبه الرشد (١٥٢٨/٤).

(٢) - العدة في أصول الفقه (١٠٥٩/٤).

(٣) - بڕوانە: مختصر الصواعق المرسله (ص ٥٨٣).

وتەیەکی ئیبنولەقییمیش هەیە نزیکە لەم تێگەیشتنەوە کە دەڵێت (مەبەستی -واتە پێشەوا ئەحمەد- بەو دەربڕینە ئەوە نیە بوونی ئیجماع بەدوور بزانێت، بەڵکو ئەحمەد و پێشەوایانی فەرمووده تاقیکراونەتەوە بە کەسانێك کە بە بانگەشەی ئیجماعی خەڵك، بەرپەرچی سوننەتی صەحیحیان دەدایەوە، بۆیە شافیعی و ئەحمەد ئەوەیان روونکردەوە کە ئەو بانگەشەیە درۆیە و ناتوانرێت بە شتی وا بەرپەرچی سوننەت بدرێتەوە).[1]

ئاراستەی دووەم: دەکرێت بۆ ئەوە بووبێت کە لەو بانگەشەدا وەرەع بکرێت، بەو واتایەی بانگەشەی ئیجماع شتێکی سەختە، لەوانەیە رایەکی جیاواز هەبێت کە نەگەیشتبێت بەو کەسەی بانگەشەی ئیجماع دەکات، بۆیە ئەمە رێنموونی پێشەوا ئەحمەدی کردووە بۆ بەکارهێنانی دەستەواژەی (وای نابینم راجیایی لەسەر بێت)، یان دەربڕینێکی هاوشێوەی ئەمە، چونکە ئەمە لە واقیعەوە نزیکترە، ئەمەش دژی ئەوە نیە زانایەکی شارەزا بە وتەی خەڵك، ئەگەر ئیجماعێکی بۆ دەرکەوت، بانگەشەی ئیجماع بکات، وەك چۆن خودی ئەحمەد شتی وایکردووە، قازی ئەبوویەعلا رەحمەتی خوای لێ بێت لە (العدة) دا دەڵێت: (رووکەشی ئەم قەسەیە ئەوەیە کە ئەحمەد رێگریی کردووە لە دروستێتی ئیجماع، بەڵام بابەتەکە بەو رووکەشیە نیە، بەڵکو لەسەر بنەمای وەرەع و خۆگرتنەوە ئەوەی وتووە نەبادا رایەکی جیاواز هەبێت و پێی نەگەیشتبێت، یان ئەوەی لە بەرامبەر کەسانێك وتووە کە هیچ شارەزاییەکیان نەبووبێت بە راجیاییی پێشین).[2]

ئەم ئاراستەی دووەم گونجاوە، چونکە لەوانەیە زانا راجیاییەکی پێ نەگەیشتبێت، بەڵام ئەو ئەگەرە زۆر لاواز دەبێت ئەگەر زانایان ئیجماعی مەزهەب و شار و وڵات و سەردەمە جیاوازەکانیان هێنابێت.

---

(١) - (١٠٦٠/٤)

(٢) - ١٠٦٠/٤.

## بەشی سێیەم: گومانەکان سەبارەت بە ڕێبازی تێگەیشتن لە دەقی شەرعیی

لە دیارترین پرسیارەکانی سەردەم لەسەر دەقی شەرعیی، مەسەلەی تێگەیشتنە، دەبینیت کەسێك دەڵێت: بڕوامان بە قورئان و فەرموودە هەیە، بەڵام بە تێگەیشتنی کێ؟ ئایا تێگەیشتنی دروست و تێگەیشتنی هەڵە هەیە؟ بۆچی بکرێت دەقێك بە چەند خوێندنەوەی جیاواز هەبێت و هەر خوێنەرێك بەپێی تێگەیشتنی لە دەقەکە وەریبگرێت بێ ئەوەی خوێنەرێکی تر بە هەڵە دابنرێت؟

ئەگەر لە ڕاستیی ئەم دەستەواژەیە ڕابمێنیت، دەبینیت سیفەتی ڕوونکردنەوەی ڕاستیی لەو بابەتانی کە موسڵمانان تیایداراجیان، لە دەق دادەماڵێت و سیفەتی یەکلاکەرەوە لە پرسە شەرعیەکانی پێ لەدەستدەدات، بەڵکو دەیەوێت بڵێت کەسی بێباوەڕیش دەتوانێت لە ڕوانگەی خوێندەوەی دەقی قورئانەوە، ئەگەر بیەوێت بە شێوازی تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لە قورئان تێبگات، بەڵگە و بیانوو بدۆزێتەوە بۆ بێباوەریەکەی، لە کاتێکدا خوای گەورە لە قورئاندا زۆر بە توندی هەڕەشەی کردووە لەو کەسەی حوکم ناکات بەوەی خوا دایبەزاندووە، چۆن دەکرێت حوکم بە قورئان بکرێت ئەگەر هەر کەسەو بە تێگەیشتنی خۆی لێی تێبگات؟ جا ئەگەر دادوەر ویستی سەد جەڵد بدات لە زینا وەك لە دەقی قورئاندا هاتووە، ئەوە دەکرێت زیناکار خوێندنەوەیەکی تر و تێگەیشتنی جیاوازی هەبێت بۆ زینای حەرامکراو، لەوانەیە وا بۆی بڕوانێت زینا تەنها بریتیە لە دەستدرێژیی، یان ناپاکیی هاوسەرێتیی!

لەکاتێکدا لەناو کەسانی سەردەمدا خەڵکێك هەن بانگەشەی ئەوە دەکەن و دەڵێن: زینای حەرام بریتییە لە ناپاکیی هاوسەرێتی، بەڵام کەسێك کە هاوسەرگیریی نەکردووە، ئەگەر لەگەڵ ئافرەتێك کە هاوسەرگیریی نەکردووە، بە ڕەزامەندی هەردوولا زینایان ئەنجام دا، مادەم بەبەرچاوی خەڵکەوە نەبێت، ئەوە بە زینا هەژمار ناکرێت! گوێم لە مامۆستای گومڕا (موحەممەد شەحروور) بوو ئەمەی دەوت، لینکی قسەکەشی بە شێوەی دەنگیی هەیە، جا ئیتر دوای ئەمە، چی لە دین دەمێنێتەوە؟! ئەگەر هەر دەقێکی قورئان بەم چەشنە بێت، ئیتر چ ڕێنموونیەك بۆ قورئان دەمێنێتەوە؟

ASTANA

هەرچۆنێك بێت، ئەمە ئاماژەیەکی خێرا بوو لەم بوارەدا، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە سەر مەزلەقی[١] یەکەم لە مەزلەقەکانی بەهەدەردانی دەقەکان لە کتێبی (ینبوع الغواية الفكرية) لە نووسینی عەبدوڵا عوجێری.

## بەشی چوارەم: پرسیارو گومانەکان سەبارەت بە حەددە شەرعییەکان

زۆرترین بابەتی حەددە شەرعیەکان کە مشتومڕی لەسەرکرابێت، بریتیە لە حەددی ڕەجم (بەردبارانکردن) و سزادانی مورتەد.

### یەکەم: حەددی ڕەجم (بەردبارانکردن)

هەندێ لە موسڵمانان نکوڵی دەکەن لەوەی لە ئیسلامدا سزای بەردبارانکردنی زیناکەرێك هەبێت کە هاوسەری هەبێت و پێیان وایە ئیشێکی دڕندانەیە، بەڵگەی رووکەشیان بۆ ئەوەی نکوڵی لەو حەددە بکەن، ئەوەیە کە ئەمە سزایەکە لە قورئاندا باسی نەکراوە، بەتایبەت کە جەڵدلێدانی زیناکەر لە سوورەتی نووردا هاتووە بێ ئەوەی باسی ڕەجمی کردبێت، هەروەك پێیان وایە سزاکە لەگەڵ چەند ئایەتێکی قورئاندا ناگونجێت.

سەبارەت بەوەش کە سزاکە وەحشیگەرانە بێت، دەبێت بزانین ڕەجم سزایە نەوەك دەستخۆشیی، سزایش ڕێلێگرتن و سەرکۆنەی تێدایە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سزایەکی زۆر قورس و سەختی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە دژایەتیی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و لە سەرزەویدا خراپە بڵاودەکەنەوە، ئەویش بریتیە لە دەست و قاچ بڕین لە پشتەوە، زۆرێك لەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکن ڕەجم سزایەکی دڕندانەیە، ئەو سزای تری ناو قورئانیان لا پەسەندە.

---

(١)- مەبەست بە مەزلەق، شوێنی خزین و خلیسکانە، بۆیە لەسەرەوە وەرماننەگێڕا، چونکە لە سەرچاوە عەرەبییەکەدا بەو چەشنە هاتووە، بۆ ئەوەی هەر خوێنەرێك ویستی بچێتەوە سەر بابەتەکە، بە ناوەکەدا بیدۆزێتەوە. وەرگێڕ.

خوای گەورە کە ئەو سزایانەی داناوە، بەپێی حیکمەت و زانایی و دانایی خۆی دایناوە و ئێمە لای خۆمانەوە حەددی وامان دانەناوە، بەڵکو تەنها دان دەنێین بە راستی ئەو گێڕانەوە دروستانەی کە سەلماوە لە پێغەمبەرەوەن ﷺ.

حەق وایە باوەڕدار بڵێت: زینای کەسی هاوسەردار چەند پیس و ناشیرینە کە خوای گەورە حەددێکی وا سەختی لەسەر داناوە، ئەمەش بەڵگەی بێزراویی ئەو تاوانەیە.

نکووڵیکردن لە رەجم لەبەرئەوەی لە قورئاندا نەهاتووە، رێی دروستی ئەوانە نیە کە شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتون، چونکە لە سوننەتی یەکلاکراوەدا لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە لە سەردەمی خۆیدا کەسانێکی رەجم کردووە کە هاوسەرداربون و زینایان کردووە، دیوی یەکلاکراوەی ئەو گێڕانەوانە ئەوەیە کە لە چەند لایەکی دروستەوە گوازراوەتەوە کە هەرکەس شارەزای یاساکانی گێڕانەوەو بارودۆخی گێڕەرەوەکانە، نەوەك کەسێك ئەو شتانە نەزانێت، وەك زانیاریی مامەڵەی لەگەڵ دەکات.

ئەهلی سوننەش کۆدەنگن لەسەر ئەو حەددە:

ئیبن عەبدولبەر رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (بیدعەکارانی خەواریج و موعتەزیلە وای نابینن زیناکارێك، هاوسەرگیر بێت یاخود زوگورت، نابێت رەجم بکرێت، بەڵکو لای ئەوان زیناکار تەنها جەڵدی لێ دەدرێت، هاوسەردار و بێهاوسەریش لای ئەوان یەکسانن، ئەم قسەشیان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و رێی باوەڕدارانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی دوای خۆیشی زیناکەری هاوسەرداریان رەجم کردووە و زانایانی موسڵمانیش لە ناوچەکانی جیهانەوە لە ئەهلی راو بۆچوون و بواری فەرموودەش کە ئەهلی حەقن، هاوڕان لەسەر ئەوە).[١]

ئیبن قودامەی مەقدیسی رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: واجبە زیناکاری هاوسەردار رەجم بکرێت .. ئەمە قسەی کۆی ئەهلی عیلمە ... نەماندیوە جگە لە خەواریج کەسی تر لەوەدا رای جیاوازی هەبێت).[٢]

(١) - التمهيد لما في الموطأ من المعاني و الأسانيد (١٢١/٢٣).

(٢) - المغني التركي، (٣٠٩/١٢).

ئیبن بەتتال دەڵێت: (هەواڵی دروست لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە فەرمانی کردووە بە رەجم و خۆیشی رەجمی -زیناکاری هاوسەرداری- کردووە، مەگەر ئاگادار نیت بە قسەکەی عەلی: لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ رەجممان کردووە، عومەری کوڕی خەتتابیش رەجمی کردووە، بۆیە رەجم بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ و کرداری خەلیفەکانی راشیدین و بە یەکدەنگی پێشەوایانی ئەهلی علیم چەسپاوە، لەو پێشەوایانەش مالیکی کوڕی ئەنەس لە خەڵکی مەدینە و ئەوزاعی لە خەڵکی شام و سەوری و کۆمەڵێکی تر لە خەڵکی عێراق و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبووسەور، خەواریج و موعتەزیلەش نەیانپێکاوە لەوەی دژی رەجمن و بانگەشەیان ئەوەیە کە رەجم لە کتێبی خوادا نەهاتووە).[1]

سەبارەت بە نکوولیکردنی سزاکە بەو بانگەشەی لەگەڵ هەندێ ئایەتی قورئاندا ناگونجێت، وەك فەرمایشتی خوا سەبارەت بە کەنیزە (فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ)، (نیوەی ئەو سزایان لەسەرە کە لەسەر ئافرەتانی هاوسەردار هەیە)، دەڵێن: مەبەست بە محصنات بریتییە لە هاوسەردارەکان، لای ئێوەش هاوسەردارەکان رەجم دەکرێن، ئەمەش پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە، چونکە رەجم ناکرێت بە نیوە.

وەڵامدانەوەی ئەم بانگەشەیە بەوە دەبێت هەڵە تەفسیرکردنی (المحصنات) ی ناو ئایەتەکە روونبکرێتەوە، چونکە وا تەفسیر کراوە کە مەبەست پێی ئافرەتانێکن کە شوویان کردووە، بەڵکو مەبەست پێی ئافرەتانی ئازادە، هەرکەسیش سەرەتای ئایەتەکە بخوێنێتەوە، زۆر بە روونی بۆی دەردەکەوێت، چونکە تیایدا هانی ئافرەتانی (محصنات) دەدات بۆ هاوسەرگیری، واتە ئافرەتانی ئازاد.

سزای ئافرەتی ئازاد ئەگەر شووی کردبێت و زینا بکات، بریتیە لە رەجمکردن و سزاکەش نیوە ناکرێت، بەڵام ئەگەر ئافرەتانی ئازادی شوونەکردوو زینا بکەن، سزاکەیان سەد جەلدە، ئەمەیان نیوە دەکرێت، بۆیە حەددی کەنیزەیەکی زیناکەر دەبێتە نیوەی ئەوە کە پەنجا جەلد دەکات.

---

(١) - شرح ابن بطال (٤٣١/٨).

لە کۆتاییدا، قسەکردن لەسەر ئەو گومانانەی لەسەر ئەم حەددە دەوروژێنرێن، زۆر زیاتری دەوێت لەم کورتبڕییە، لە کتێبی (کامل الصورة ١) دا وەڵامی هەندێ لەو گومانانەم داوەتەوە کە لەسەری دەورووژێنرێن، هەرکەس حەز دەکات زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە وەربگرێت، ئاڕاستەی دەکەم بۆ لای کتێبی (شبهات حول أحاديث الرجم و ردها) لە نووسینی دکتۆر سەعد مرصفی کە لە تۆڕی ئینتەرنێتیش بەردەستە.

پێویستە بزانین سزای ڕەجم لەوانەیە نەیەتەدی مەگەر تەنها بە دانپێدانانی خودی زیناکار، چونکە مەرجەکانی سەلمان و جێبەجێکردنی حەددە لەوپەڕی قورسیدان، ئەو کەسەش کە خۆی دێت و دانی بە تاوانەکەیدا دەنێت، خۆی ئەوە هەڵدەبژێرێت و زۆری لێ ناکرێت، چاکتر وایە ئەو تاوانانە پەردەپۆش بکرێن نەوەك دەستپێشخەری بکرێت بۆ دانان بە تاواندا، تەنانەت ئەگەر کەسێکی یەکێکی بینی زینای دەکرد، باشتر ئەوەیە پەردەپۆشی بکات و هەواڵی نەگەیەنێت بە فەرمانڕەوا، مەگەر ئەوەی کەسەکە بە ئاشکرا تاوانەکە بکات، ئیتر ئەمەیان ئەچێتە بواری ڕێلێگرتن و ڕێگریکردنەوە.

## دووەم: سزای لەدین هەڵگەڕانەوە:

گەورەترین ڕەخنەیەك لەم سزایە دەگیرێت، ئەوەیە کە لەگەڵ فەرمایشتی خوادا ناگونجێت (لا إكراه في الدين)، لە ڕاستیدا ئەم ئایەتە لای هیچ زانایەکی موسڵمان شاراوە نەبووە، ئەو زانایانەی کە کۆدەنگن لەسەرئەوەی سزای هەڵگەڕانەوە لە دین کوشتنە، ئیبن قودامەی مەقدیسی دەڵێت: زانایان لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە واجبە کەسی لەدین هەڵگەڕاوە بکوژرێت).[١]

لێرەدا سێ ئەگەر بەرامبەر هەڵوێستیان لە ئاست ئەم ئایەتەدا دەخەینەڕوو:

یان هەموویان لە واتای ئەم ئایەتە تێنەگەیشتون.

یان لێی تێگەیشتون و زانیویانە، بەڵام شاردویانەتەوە و بە ئەنقەست پێچەوانەی جووڵاونەتەوە.

---

(١) - المغني ط عالم الكتب (١٢/٢٦٤).

یان وا لە تەفسیرەکەی تێگەیشتون کە لەگەڵ فەرموودەی کوشتنی مورتەددا ناتەبا نیە.

بێگومان ئەگەری سێیەم راستە و هەر موسڵمانێك ئەوەی بۆ خۆی پێ پەسەندە، ئیتر چ جای بۆ هەموو زانایانی ئوممەت.

ئەو زانایانە بێئاگا نەبون لەم بابەتە، پێشەوای راڤەکاران ئیبن جەریری تەبەری رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (هەموو موسڵمانان ئەوەیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گواستۆتەوە کە خەڵکێکی زۆر لێکردووە بۆ موسڵمانبوون و رازی نەبووە جگە لە ئیسلام هیچیان لێ قبووڵ بکات و بڕیاری داوە بە کوشتنیان ئەگەر رازی نەبوون بێنە ناو ئیسلام، ئەوەش وەك بتپەرستان لە موشریکەکانی عەرەب، هەروەها وەك ئەو مورتەدێك کە لە دینەکەی هەڵدەگەڕێتەوەو دەچێتەوە نێو بێباوەڕی، یان کەسانی هاوشێوەی ئەوانە، هاوکات وازی هێناوە لەوەی زۆر لە کەسانی تر بکات بێنە ناو ئیسلام و بەوە رازیی بووە سەرانەی پێ بدەن و لەسەر دینی باتڵی خۆیان بمێننەوە، ئەمەش وەك ئەهلی کیتاب و هاوشێوەکانیان، بەمەش واتای فەرمایشتی خوای روونکردۆتەوە (لا إكراه في الدين)، بۆیە هیچ زۆرێکی نەبووە بۆ موسڵمانبوونی هەر کەسێك کە رەوا بێت سەرانە بدات و ئامادەیی دەربڕیبێت بە پێدانی سەرانە و رازیبوون بە حوکمی ئیسلام).

ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (کۆمەڵێکی زۆر لە موسڵمانان پێیان وایە ئەمە ئەهلی کیتاب دەگرێتەوە).

مەسەلەی سزادانی مورتەد، یەکێکە لە گەورەترین ئەو رەخنانەی لەلایەن مولحید و نائایینیەکانەوە بەرامبەر بە ئیسلام دەوروژێنرێت، هەروەك لەلایەن زۆرێك لە موسڵمانانەوە بە مەبەستی بەرگریکردن لە ئیسلام هەمان گومان دەورووژێنرێت، ئەو موسڵمانانە پێیان وایە ئەمە لەگەڵ بنەماکانی لێبوردەیی ئیسلامیدا ناگونجێت، هەروەك بڕێك رووداوی ناو ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دەکەنە بەڵگە، لەمەشدا سنووری دەقەی صەحیحی روون و راشکاو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سەبارەت بە کوشتنی مورتەد تێدەپەڕێنن، ئەگەرچی مەبەستیان نیە -مەبەستم ئەو موسڵمانانەیە کە

مەبەستیان بەرگریکردنە لە ئیسلام- پێچەوانەی فەرمووده و ڕێنماییەكانی پێغەمبەر ﷺ بجووڵێنەوە، بە بۆچوونی من، ئەو موسڵمانانەی ئەو سزایان لێ بووە بە كێشە و جێی پرسیار، پێویستە بە زبری مامەڵەیان لەگەڵ نەكرێت، بەڵكو بابەتەكەیان بۆ شی بكرێتەوەو شێواندنی مەسەلەكەیان بۆ ڕوون بكرێتەوە، چونكە ئەم بابەتە قسەی زۆری لەسەرە و چەندین ئەسەر و فەرموودەی وای لەسەرە كە پێویست بەوە دەكات كەسێكی داپەروەر لەنێوان تێگەیشتن و لەخواترسیدا یەكدەستییەكی هەبێت هەتا لەم پرسەدا بگاتە بڕیاری دروست.

هەروەك زۆر دەستگرتن بە وشەی (حەدد) لەم بابەتەدا، لەوانەیە هەندێك لێتێكەڵبوون لە تێگەیشتنی لێبكەوێتەوە.

سەرچاوەی سەرەكیی كێشەكە لە بابەتی سزادانی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، لە ڕۆشنبیریی ناوەندیبوونی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە كە لەم سەردەمەدا زاڵە، چونكە ئەم سزایە لە فەرهەنگی ئیسلامیدا هیچ جێی كێشە و مشتومڕ نەبووەو تەنها لەم سەردەمەدا بەم چەشنە كراوە بە كێشە، لەكاتێكدا ئەوانەی نكوولی لەم سزایە دەكەن، ڕاشكاوانە دان نانێن بە مەسەلەی ناوەندیبوونی مرۆڤدا، بەڵكو دەستیان گرتووە بە هەندێ دەقەوە كە بە تێڕوانینی خۆیان، دەیانگەیەنێنە ئەوەی نكوولی لەم سزایە بكەن، هەولیش دەدەن لەبەر چەند هۆكارێكی پڕ ئاڵۆزی تر، دەقەكانی دی بە كەم بگرن، كەسێك كە ئەمە دەبینێت، هەست بەوە دەكات ئەم سووربوون و دەستپێوەگرتنە، سەرچاوەكەی لە پاڵنەرێكی دیكەی ناوەكیەوەیە كە لەوانەیە هەستی پێ نەكەن، ئەویش فشاری ڕۆشنبیریی ناوەندێتی مرۆڤە، بەڵام كاتێك لە سەدەكانی تردا ڕۆشنبیریەكە بەم چەشنە نەبوو و ناوەندێتی الله پێش ناوەندێتی مرۆڤ دەخرا، ئەم سزایە هیچ كێشە و پرسیارێكی دروست نەدەكرد.

هەرچۆنێك بێت، لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە بە دووروودرێژی بەڵگەكانیان لەسەر ئەم نكوولیكردنە بخەمە بەرباس، لە كتێبەكەشمدا (كامل الصوره ١) دە ڕەخنەی سەر سزای هەڵگەڕانەوە لە دین و وەڵامی ڕەخنەكانیشم باسكردووە، هەروەك یەكێكی تر لەو كتێبە بەسوودانەی لەم بوارەدا نووسراوە، بریتیە لە كتێبی (فضاءات الحریة) لە نووسینی سوڵتان عومێری و كتێبی (الردة بین الحد و الحریة) لە نووسینی صالح عومێرینی.

## بەشی پێنجەم: گومانەکان لەسەر هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت)

ئەهلی سوننەو جەماعە یەکدەنگن لەسەر راستاڵی (عەدالەتی) هاوەڵان، بەڵگەشیان بۆ ئەوە چەند بەڵگەیەکی ناو قورئان و سوننەت و واقیع و ژیاننامەی هاوەڵانە، ئەم بوارەش یەکێکە لەو بوارە شەرعیانەی کە ئیجماعی ئەهلی سوننەی لەسەر هاتووە، ئێرە شوێنی ئەوە نیە کۆدەنگیەکانی ئەهلی سوننەی لەسەر بهێنین، بەڵام تەنها چەند نموونەیەکیان دەخەمەڕوو بۆتان:

ئیبن عەبدولبەر دەڵێت (ئەگەرچی وازمان هێناوە لە لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی هاوەڵان، لەبەرئەوەی کۆدەنگیی ئەهلی حەقی ناو موسڵمانانی لەسەرە کە ئەوانیش بریتین لە ئەهلی سوننەو جەماعە، کۆدەنگن لەسەر راستاڵیی هاوەڵان).[١]

جوەینی لە (البرهان في أصول الفقه) دا دەڵێت: لەوانەیە ئەو هۆکارەی وایکردووە خوای گەورەی کۆدەنگی -موسڵمانان- لەسەر عەدالەتی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بهێنێتەدیٚ، بریتی بێت لەوەی هاوەڵان شەریعەتیان نەقڵ کردووە، خۆ ئەگەر وەستان لە گێڕانەوەکانیاندا رووبیدایە، ئەوە شەریعەت بەرتەسك دەبوویەوە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ و شۆڕ نەدەبوویەوە بۆ سەرجەم سەردەمەکانی تر.[٢]

غەزالی رەحمەتی خوای لێ بێت لە (المستصفى) دا دەڵێت: ئەوەی پێشینی ئوممەت و جمهوری زانایانی دوای ئەوانیشی لەسەرە، ئەوەیە کە عەدالەتی هاوەڵان زانراوە بەوەی خوای گەورە راستاڵیی پێداون و لە کتێبەکەیدا ستایشی کردون، ئەمە بیروباوەڕی ئێمەیە بەرامبەریان)، پاشان دەڵێت (چ راستاڵیەك دروستتر لەوەی خوای شارەزا بە نهێنیەکان و پێغەمبەرەکەی بە راستاڵیان بزانن، خۆ ئەگەر باسی ستایشیشیان نەهاتبا، ئەوە بە تەواتور باسی کۆچ و جیهاد و بەختکردنی ماڵ و گیان و کوشتنی باوك و برا و کەسوکار لەپێناو هەوارداریی بۆ پێغەمبەر ﷺ و سەرخستنی، تەنها ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی راستاڵیی هاوەڵان یەکلا بکاتەوە).[٣]

---

(١) - الإستيعاب في معرفة الأصحاب (٧/١).

(٢) - البرهان في أصول الفقه (٦٣٢/١).

(٣) - المستصفى (٣٠٧/١).

عەلائی دەڵێت (ئەو بابەتە جێگیرە و ئەهلی سوننەو جەماعە ئەو بڕیارەیان لەسەر داوە، مەبەستم ئەوەیە کە دەڵێت هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ راستاڵییان هەبووە، وتەی بیدعەکاران و ئارەزووبازانیش هیچ بەهەند وەرناگیرێت).[١]

ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت (ئەهلی سوننە یەکدەنگن لەسەر راستاڵێتی هاوەڵان)،[٢] وەك پێشتریش وتمان ئیجماع لەوبارەوە زۆرە.

ئەو گومانانەی لە بواری هاوەڵاندا دەورووژێنرێن زۆرن، هەندێکیان بۆ ئەوە دەگەڕێنەوە کە بڕێك هەڵەی هاوەڵان دەکەنە بەڵگە بۆ تانەلێدانیان، بەتایبەت سەبارەت بە رووداوی جەمەل و صفین، بۆ وەڵامی ئەم گومانەش، دەکرێت بڵێین:

**یەکەم:** ئێمە ناڵێین هاوەڵان عیصمەتیان هەبووە، بەڵکو دەڵێین راستاڵی و پلەی بەرزتریان هەبووە، بۆیە دەکرێت هەڵەیان کردبێت، جا ئەگەر گێڕانەویەك بهێنرێت کە بکرێتە بەڵگەی ئەوەی کەوتوونەتە هەڵەوە یان تاوانیان کردووە، ئەمە هیچ شتێکی نوێی تێدا نیە، ئەمەش زۆر گومان و پرسیار وەڵام دەداتەوە کە نەیاران دەیانخەنەڕوو.

**دووەم:** زۆربەی ئەو گێڕانەوەی کە گومانسازان بەرامبەر بە هاوەڵان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیانگێڕنەوەو تیایدا سەرکۆنەی هەندێ هاوەڵی کردووە، یان ئەو گێڕانەوانەی باس لە فیتنەی نێوان هاوەڵان دەکەن لە جەمەل و صفین و شوێنانی تریدا، زۆربەیان سەنەدێکی چەسپاویان نیە، بۆیە ئەو کەسەی دەقێك دەگوازێتەوە -وەك پێشتر لە باسی بنەماکانی مامەڵە لەگەڵ گومانەکاندا باسمان کرد- پێویستە دروستیی گێڕانەوەکە بسەلمێنێت پێش ئەوەی داوای وەڵام و روونکردنەوەمان لێبکرێت، ئەمەش بنەمایەکی گرنگە، ئەو کەسەش بەدوای قسەی گومانسازانی سەر هاوەڵاندا بڕوات، دەبینێت زۆربەی ئەو شتانەی ئەوان پشتیان پێ دەبەستن بۆ تانەدان لە هاوەڵان، لەبەردەم مەرجەکانی فەرمووودەناساندا زۆر خۆیان پێ راناگیرێت، دووفاقیەکی ئارەزووبازان کە شتێکی نامۆ نیە بۆ

---

(١) - جامع التحصيل، ص ٧٣.

(٢) -الفتاوى (٥٤/٣٥).

ئەوان، ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانەی لەسەر بنەمای چەند گێڕانەوەیەکی نەچەسپاو تانە لە هاوەڵان دەدەن، لە هەمان کاتدا گومان دەخەنە سەر فەرمووده صەحیحە چەسپاوەکانی پێغەمبەری خواﷺ.

**سێیەم:** هەندێ تاوان کە هاوەڵان ئەنجامیان داوە، زۆربەیان بەڵگەن لەسەر گەورەییان، دەبینیت خێرا دەستپێشخەرییان کردووە بۆ تەوبە و پەشیمانی و داننا بە تاوانەکەیاندا، بەڵکو زۆر سوور بون لەسەرئەوەی لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ حەددی شەرعییان لەسەر جێبەجێ بکرێت، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەرئەوەی بەگەورەدانانی خوا و لەخواترسیان هەبووە.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەو ئافرەتە جوهەنیەی کە زینای کردبوو، فەرمووی (لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ، وَهَلْ وَجَدْتَ تَوْبَةً أَفْضَلَ مِنْ أَنْ جَادَتْ بِنَفْسِهَا لِلهِ تَعَالَى)،[1] (بەڕاستی تەوبەیەکی کردووە، ئەگەر تەوبەکەی دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەسی ناو مەدینەدا، بەشیان دەکات، مەگەر تەوبەیەك باشتر لەوە بەدیدەکرێت کە گیانی خۆی بەختکردووە لەپێناو خوادا).

**چوارەم:** ئەهلی سوننە کۆدەنگن لەسەر دادپەروەریی و فەزڵ و گەورەییان و وەرگرتنی گێڕانەوەکانیان، پێشتریش لەسەر ئەمە چەند کۆدەنگیەکمان باسکرد، ئەمەش لەو کۆدەنگییە چەسپاوە بەدیهاتوانەیە کە لەسەر بنەمای دەقی قورئان و فەرموودە و ئەوەی سەبارەت بە فەزڵ و لەپێشینەبوونیان هاتووە، دامەزراوە، دوای کۆدەنگیی ئەهلی سوننەش، تەنها بیدعەکاران خۆیان جیادەکەنەوە.

---

(١) - صحيح مسلم، الرقم ١٦٩٦.

# چەند پوختەیەك
# لە چەند سەرەباسێکی هزریی گرنگدا

## پوختەی یەکەم: سەبارەت بە عەقڵ و شەرع

**یەکەم:** ئەو کەسەی دەڵێت: عەقڵ پێش شەرع دەخرێت لەبەرئەوەی شەرع بەهی عەقڵەوە زانراوە، بۆیە دەبێت عەقڵ بڕیار لەسەر شەرع بدات، لە وەڵامدا پێی دەڵێین: کاتێك عەقڵ ڕێنمونی کردوین بەرەو شەرع، ئەوە ڕێنموونی کردین بۆ سیفەتێکی پەیوەست بە شەرع کە بریتیە (دووربوون لە هەڵە و کەموکورتی)، لە هەمان کاتدا عەقڵ ئەو عیصمەت و دووربوونە لە هەڵە و کەموکورتی بۆ خۆی بە ڕەوا نازانێت، دەی چۆن دەکرێت سەرچاوەیەك کە هەڵە وپڵەی هەیە، پێشی بخەین بەسەر سەرچاوەیەکی بێ هەڵە و پەڵەدا؟

ئەگەر نەزانێك زانایەکمان پێ بناسێنێت، ئەمە واتای ئەوە نیە قسەی نەزانەکە پێش قسەی زاناکە بخرێت و ئەوە بکرێت بە بەڵگە گوایە نەزانەکە ئەو زانایەی پێ ناساندوین، بەڵکو هێندەی ڕێنموونی کردوین بۆ لای زانایەك بەسە، ئیتر دوای ئەوە دەبێت شوێنی زاناکە بکەوین نەوەك نەزانەکە.

**دووەم:** تێگەیشتنەکان جیاوازن، پێوەرەکانی وەرگرتنی خەڵك و قبووڵکردنی گێڕانەوەکانیش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی جیان، ئەمەش بەپێی شێوازی پەروەردەی هەرکامیان و باوردۆخی گەورەبوون و پێگەیشتنی و ئەو دەوروبەرو کۆمەڵگەی تیایدایە، بۆ نموونە ئەو کەسەی لە دارستانەکانی ئەفریقادا دەژی، شتێك بە پێچەوانەی عەقڵ دەزانێت، لەکاتێکدا ئەو کەسەی لەناو شارستانیەتی سەردەمدا پێگەیشتووەو گەورە بووە، بە پەسەندکراوێکی عەقڵیی تەماشای دەکات، بەڵکو لەوانەیە بە شتێکی بێ چەنوچونی عەقڵیی تەماشای بکات.

بۆیە، هەرکەس نکوولّی لە دەقێکی شەرع بکات لە بواری تێگەیشتندا، با پەلە ئەم گرێ و گومانە نەباتەوە بۆ صەریحی عەقڵ، بەڵکو با پێداچوونەوەی تێڕوانینی خۆی و کەسانی تری ژیر بکاتەوە، لەوانەیە دەربکەوێت کێشەکە لە خودی شێوازی تێگەیشتنی خۆی و ئەو ئاستی وەرگرتنەی بێت کە لەو قەناعەتە بێ چەنوچونانەی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبێت کە لە ماوەی گەشە و پێگەیشتنی و ئەو شوێن و بارودۆخەی کە زاڵ بووە بەسەر پێکهاتە و ژیانیدا، وەدەستهاتووە.

لەسەر بنەمای ئەمەش: ئەگەر خاوەن عەقڵە ئازادە بیریارەکان لە وەرگرتن و بەرپەرچدانەوەی فەرموودەیەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ راجیابن، لەوێدا کێ دادوەر بێت؟ باشتر ئەویە عەقڵی خۆی پێش عەقڵی کەسانی تر بخرێت؟ دەڵێین: دەبێت هۆکارێکی دەرەکی هەبێت کە ئەویش بریتیە لە پێناوی سەلماندن لە شەرعدا، بەو واتایەی ئەو گێڕانەوەی لە رووی عەقڵیەوە راجیایی لەسەرە، لەگەڵ ئەوەدا پێویستمان بەوەیە شتێك بیسەلمێنێت ئایا پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرمووە یاخود نا، ئەگەر سەلما ئەوەی فەرمووە، ئەوە هەرگیز پێچەوانەی عەقڵ نیە.

**سێیەم:** پێویستە درك بە سنوورەکانی عەقڵ بکرێت:

پێشەوا شاتیبی رەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (خوای گەورە بۆ درکی عەقڵەکان سنوورێکی داناوە کە ناتوانن تێیپەڕێنن، رێگەشی بە عەقڵ نەداوە درك بە هەموو داخوازییەك بکات).[1]

داننان بە سنووری عەقڵدا، کەمکردنەوەی شان و شکۆی نیە، بەڵکو دانانیەتی لەو شوێنەی شایەنیەتی، لێرەوە هەنگاو دەنێین بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ پرسیاری غەیبیی کە لەوانەیە عەقڵ واقو وڕ بکەن.

**چوارەم:** گرنگیی جیاکردنەوەی گونجاو و نەگونجانەکانی عەقڵ، واتە جیاکردنەوەی ئەوەی عەقڵ رێی تێدەچێت، لەگەڵ ئەوەی عەقڵ رێی تێناچێت.

لەوانەیە شەریعەت هەندێ بابەتی پێ بێت کە عەقڵ واق و وڕ رابمێنێت، یان لای نامۆ بێت، بەڵام شتێك ناهێنێت کە عەقڵ رێی تێنەچێت و لەگەڵ عەقڵدا نەگونجێت.

---

(١) - الإعتصام للشاطبي (١/٨٣١).

ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێت، لە (الجواب الصحیح) دا دەڵێت: (پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەوەی عەقڵ دەزانێت باتڵە و پێویستە رێگریی لێ بکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە عەقڵ ناتوانێت وێنای بکات و بیزانێت، یەکەمیان ئەوەیە کە عەقڵ رێی تێناچێت، بەڵام دووەمیان ئەوەیە کە عەقڵ رێی تێدەچێت، پێغەمبەرانیش باسی ئەوەی دووەمیان هێناوە).[1]

هەروەها لە هەمان کتێبدا دەڵێت: (پێغەمبەران هەندێ جار هەواڵ دەدەن لەسەر شتێك کە عەقڵ ناتوانێت بیزانێت، نەوەك بە شتێك کە عەقڵ بزانێت بەتاڵ و نادروستە، بۆیە رێتێچوونەکانی عەقڵ باس دەکەن نەوەك رێتێنەچوونەکانی).

لێرەشدا ئاماژە بە سێ سەرچاوە دەکەم لەم بوارەدا:

(ینبوع الغواية الفكرية) لە باسی بەهەدەردانی دەق بەهۆی عەقڵەوە.

(مختصر السواعق المرسلة) لە نووسینی ئیبنولقەییم.

مەوسوعەی گەورەی (درء تعارض العقل و النقل) لە نووسینی ئیبن تەیمیە، بەڵام ئەم سەرچاوەیان بۆ کەسەی سەرەتایی و مامناوەندیش نابێت، بەڵکو مەوسووعەیەکی گەورەیە کە جۆرێك لە قورسیی تێدایە، بەڵام بۆ ئەم بوارە گشتگیرە.

## پوختەی دووەم: سەبارەت بە نەگونجان و ناتەبایی نێوان زانستی سروشتی و ئایین

دوودڵم لەوەی ئەم بابەتە بخەمە نێو بەندی (پوختەکان) ەوە، چونکە بابەتێکە لقی زۆری لێ دەبێتەوە و سەختە لە چەند دێڕێکی دیاریکراودا کۆیان بکەیتەوە، هەروەك بابەتی (عەقڵ و نەقڵ) نووسین و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر نیە، هێندە بەسە ئاماژە بکەم بە هەندێ شت کە بە گرنگی دەزانم و دوای ئەوەی ئاراستەتان بکەم بۆ هەندێ سەرچاوە لەو بوارەدا.

**یەکەم:** تێڕوانینی دروست لەم بوارەدا ، نایەتەدی بەبێ شارەزابوون لە سروشتی ئەو بارودۆخانەی کە زانستی سروشتی لە سەردەمی نێودا پێیدا تێپەڕیوە، هەروەها

[1] - الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح (٣٩١/٤).

پێویستی بە شارەزابوونە لە سروشتی ئەو ململانێیانەی کە کۆمەڵگەی ئەورووپیدا بەو هۆیەوە سەریانهەڵدا، ئیدی چ ئەوانەی پەیوەندییان هەبوو بە کڵێسا یان هەندێ پیاوی ئایینی کڵێساوە، ئەو مێژووەو سروشتی ئەو بارودۆخەی دەوری سەرهەڵدانی زانستی سروشتی دابوو، وایکرد ئەوانەی سەر بەو زانستە بوون، تەواو دوور بگرن لە هەرچیەکی ئایینی یان غەیبی، ئیدی لە ئەندێشەی زۆربەیاندا ئەوە دروست بوو کە زانست یان مرۆڤایەتی، کاتێك لە بواری دۆزینەوە زانستیەکاندا هەنگاوی نا کە خۆی لە کۆتی ئایین و دەسەڵاتی کڵێسا رزگار کرد، بۆیە دەستکەوتە زانستیەکان لای ئەوان- ئەگەر یەکلاییش نەبێت- پێش هەر دەستکەوتێکی تر خراوە، بەڵکو زانستە ئایینی و فەلسەفییەکان بە زانستە ساختەکان ناودەبەن، هەر بابەتێك هەبێت پەیوەندیی بە پرسێکی ئایینی یان عەقڵیی فەلسەفیەوە هەبێت، نایخەنە نێو ریزی دەستکەوتەکانی زانستی ئەزموونیەوە.

ئێمەش خولگەیەکی ئایینیمان هەیە کەلەسەر بنەمای دەستکەوتی عەقڵی و بەڵگەی تەواو و تێروتەسەل دامەزراوە، ئەم خولگەش، بڕوامان وایە ناتەبا نیە لەگەڵ هیچ دەستکەوتێکی ئەزموونیی دروست و چەسپاوی یەکلاکەرەوەدا، بڕواشمان وایە لەسەر چەندین بنەڕەت دامەزراوە کە لێرەدا دەرفەت نیە باسیان بکەین، بەڵام ئەوەی مەبەستمە سەرنجی خوێنەری بۆ رابکێشم، ئەوەیە کە دەبێت مێژووی سەرهەڵدانی زانستی ئەزموونی و ئەو بارودۆخە بخەینەڕوو کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لە کاتی سەرهەڵدانی ئەو زانستەدا تیایدا دەژیا، چونکە ئەو بارودۆخە بوو وایکرد هەڵوێستی دژ بەرامبەر بە ئایین و بابەتە غەیبیەکان دروست ببێت.

**دووەم:** هەندێ وەك کۆمەڵگەیەکی بێلایەنی وا سەیری کۆمەڵگەی زانستیی ئەزموونی دەکات کە کاریگەر نەبووبێت بە هیچ بیروباوەڕێکی پێشوەختە، بۆیە هەرچی پەیوەندیەکی هەیە، بەدوورە لە هەر مەیل و داتاشین بە لایەکدا و پارێزراوە لە هەموو مەبەستێکی خراپ، ئەم قسەش وانیە، چونکە دیدێکی ماددیگەریی ئیلحادی ئەندێشەگەریەکی دیاریکراوی پێکهێناوە کە لە هەوڵی ئەوەدایە راڤەی ماددی بکات بۆ هەموو شتێك، ئەگەریش ئەوەی بۆ نەلوا، ئەوکات بەدوای چەند ئەگەرێکی ماددیدا دەگەڕێت وەك ئەگەرێك بۆ راڤەی بابەتەکان، کاتێك ئەم

ئەگەرانە لە زانایانێکەوە دەردەچن کە لە کەشی زانستیدا قورساییەکیان هەیە، ئەوکات کاریگەرییەکەی گەورە دەبێت.

بەڵکو لای زۆرێك لە زانایانی سروشت و فەیلەسووفانی ئیلحاد متمانەیەك بەوە پەیدا بووە کە ڕێبازی زانستی سروشتی لە بەڵگەخوازیدا، تاکە ڕێبازە جێی متمانە بێت و لا ناکەنەوە بەلای هیچ ڕێبازێکی تردا، پێیان وایە، زانستی سروشتی پێویستی بە هیچ سەرچاوەیەکی تر نیە بۆ ڕاڤە و تێگەیشتنی گەردوون، بەڵکو گەیشتۆتە ئاستێك بانگەشەی ئەوە بکەن خودی گەردوون بەهۆی ئەو یاسا بیرکاری و فیزیاییانەوە کە بەڕێوەی دەبەن، بێباکە لە هەر شتێك و وەك ستیڤن هاوکینگ دەڵێت، هیچ پێویست بەوە ناکات بەدیهێنەرێك هەبێت، کاتێك مەسەلەکە ئاوایە، دەکرێت هەر کەسێك تەنها لەبەرئەوەی دکتۆرە لە بواری فیزیادا، یان پرۆفیسۆرە لە بواری زیندەزانیدا، هەرچیەك سەبارەت بە زانستی ئەزموونی بڵێت، ئێمەش پشتی پێ ببەستین؟ تەنها کەسە داماوەکانن پشت بە شتی وا دەبەستن.

**سێیەم:** زانستی ئەزموونی، بە پێچەوانەی سەرچاوەی خواییەوە، بەردەوام دەستکەوتەکانی نوێ دەبنەوە و ئەزموونەکانی تازەبوونەوە وەردەگرن و بیردۆزەکانی دەگۆڕێن، بۆیە هەڵەیە بە تێڕوانینی دڵنیایی مامەڵە لەگەڵ بیردۆزە زانستیەکاندا بکەین تەنها لەبەرئەوەی دەدرێنەوە پاڵ کۆمەڵگەیەکی زانستیی ئەزموونی، چەندین نموونە هەن لەسەر چەند بیردۆزەیەکی زانستی کە ماوەیەك ڕەزامەندییان بەدەستهێناوەو بڵاوبوونەتەوەو ناوبانگیان پەیدا کردووە هەتا ئاستێك تەنها ئەوە بە ڕاست دانراوە، زۆری نەخایاندووە هەڵەی بیردۆزەکە ئاشکرا بووەو بیردۆزەیەکی تر شوێنی گرتۆتەوە، لە دیارترینی ئەوانەش بریتیە لە بیردۆزەکەی نیوتن سەبارەت بە (الأثیر) و هەندێ چەمك و واتای فیزیایی کلاسیکی کە بەهۆی هەندێ چەمك و واتای فیزیایی نوێوە شوێن پێی لەق بوو، سەرەتا بیردۆزەکانی نیوتن کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لە بواری هزر و فەلسەفە و هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر بە ئایین تا ئاستێك وای لێهات پەسەندکراوی بواری ڕاستیەکان ئەوە بێت کە وێنەی نیوتنی بۆ زانست پەسەندی بکات، ئیتر نیوتن ئەوەی وتبێت،

یان ئەوەش کە خۆی نەیوتبێت، بەڵام لەسەر بنەمای بیردۆزەکانی وترابێت، هەرچیەکیش بیردۆزەکانی نیوتن پەسەندیان نەکردایە، بەرپەرچ دەدرایەوە .. هەتا ئەو بیردۆزە زانستیانە بوون بە رێبازی هزریی وا کە زۆربەیان رووەو ئیلحاد و ماددیگەری و کەنارخستنی بنەڕەتە ئایینیەکان رۆیشتن و لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا گەیشتنە لووتکەی دیدی زانستی و مەزهەبی وەزعی .. و زانستەکان لەوپەڕی هەوڵی لاساییکردنەوەی زانستی فیزیادا بوون، زێدەڕۆییەکی زۆر لە بواری وەزعیدا گورزێکی سەخت و بەئازار بوو بۆ کۆمەڵێك راستیی رەها و هەندێ چەمك و واتای پتەوی نێو فیزیای کلاسیکی، گورزەکە لەناوخۆی خودی فیزیاوە بوو .. ئەمانەش دوو مەسەلە بوون کە لە ناوخۆی چالاکی فیزیاییدا روویاندا و بەشێوەیەکی سەروسوڕهێنەر بابەتەکانیان قولْپ کردنەوە و فیزیای دڵنیاییان لەرزاند و گۆڕییان بۆ فیزیای نادڵنیایی یان رێژەیی، ئەو دوانەش بریتی بوون لە:

**یەکەم:** ئەزموونی مایکلسۆن و مۆرلی لە ساڵی ١٨٨٧ زاینی کە چەمك و واتای (الأثير) ی لەناوبرد.

**دووەم:** دۆزینەوەی سەرسوڕهێنەری جیهانی ناوەکی کە ملکەچی یاسا دانراوەکانی فیزیا نەدەبوو،[١] ئەزموونەکەی مایکلسۆن و مۆرلی لە نێوەندی زانستیدا دەنگۆیەکی گەورەی نایەوە و زانیان سەرسام و دوودڵ و راڕا لە ئاست ئەنجامەکانیدا راوەستان، نەیاندەزانی لەسەر قسەی پێشوو بمێننەوە یا تەنانەت بگاتە ئەوەی بڵێت زەوی جێگیرە و ناجووڵێت، یان دانی پێدا نەنێن هەرچەندە چەندین پاشکۆی لەخۆ گرتووە و چەندەها بیردۆزەی تری لەسەر بنیادنراوە.

موستەفا مەحموود لە کتێبەکەیدا (أنشتاين و النسبية)، پاش ئەوەی باسی ئەزموونی مایکلسۆن و مۆرلی دەکات، دەڵێت (ئەمە واتای ئەوە بێت زانایان باوەڕ بەوە بکەن کە بیدرۆزەی الأثير قسەیەکی پووچە و شتێك نیە بەناوی الأثير، یان وای دابنێن زەوی لە فەزادا سوکنای گرتووە، پێشتر ئەو بیردۆزەیە لای زانایان

---

(١) - النظريات العلمية الحديثة، حسن الأسمري (١/٢٢٧-٢٢٨).

هێندە بەرز و بڵند بوو کە هەندێکیان گومانیان دروست دەکرد لەسەر جووڵەی زەوی و پێیان وابوو جێگیرە و ناجووڵێت).[١]

پاش ئەوەی ئەزموون هەڵەی ئەو بیردۆزەی سەلماند، گەڕان بە دوای لەبریێتی (بەدیل)ێکدا کە بتوانرێت بە پشت پێ بەستنی، جووڵەی شتەکانی پێ پێوانە بکرێت، هەتا ئەنیشتاین هات و راڤەی ئەو گرێ و گۆڵەی کرد، وەڵامەکەشی ئەوەبوو کە پێوەرێك نیە و جوولەی شتەکانیش رێژەییە، هەر جووڵەیەك بەپێی شوێنی تێبینیکراو بە جگە لەخۆی بەراورد دەکرێت.[٢]

چوارەم: وەك پێشتر وتم، ئەم بابەتە لقی زۆری لێ دەبێتەوەو پێویست بەوە دەكات مێژووی زانستی نوێ و شتێك لە فەلسەفەكەی بخوێنرێتەوەو رەخنەی لێ بگیرێت، بۆ زانیاریی زیاتر لەم بوارەدا، بگەڕێنەوە سەر ئەم سەرچاوانە:

کتێبي (النظريات العلمية الحديثة، مسيرتها الفكرية و أسلوب الفكر الغربي في التعامل معها) لە نووسینی دکتۆر حەسەن ئەسمەری.

کتێبي (العلموية) لە نووسینی دکتۆر سامی عامیری.

نامەی دکتۆرای سوڵتان عومێری باسی (النزغة العلموية)

بەشی (درء تعارض العلم التجريبي والنقل) لە کتێبی (میلیشیا الإلحاد) لە نووسینی عەبدوڵا عوجێری.[٣]

وانەیەکی دکتۆر سامی عامیری لە ماڵپەری یوتیوب بە ناونیشانی (العلموية، عرض و نقد).

---

(١) - انیشتاین و النسبیەن ص ٣٧-٣٨.

(٢) - النظريات العلمية الحديثة (٢٣١/١).

(٣) - لە چاپی دووەمی کتێبەکەدا لە لاپەڕە ١٤١ بەدواوە.

## پوختەی سێیەم: پرسی ئازادی لە ئیسلامدا

**یەکەم:** زانینی چەمك و واتای ئازادی لە ئیسلامدا، ئایا بابەتێکی عەقڵیە، یاخود بابەتێکی شەرعی؟

وەڵامی دروست: بابەتێکی شەرعیە، چونکە ناتوانین تەنها بەهۆی عەقڵەوە لە زۆر حوکمی ئیسلامیی پەیوەست بە بابەتی ئازادی تێبگەین، وەك حوکمی سەرانە و ئەهلی زیممە و لە چ شتێکدا حەد و سزا واجب دەبێت و لە چیدا واجب نابێت، ئەمانە و چەندین بابەتی تری ناو حوکمە شەرعیەکان کە پەیوەندییان هەیە بە بابەتی ئازادیەوە، بۆیە بابەتەکە بیستراوی شەرعییە، لەسەر ئەم بنەمایەش دەگەینە ئەوەی رێی زانینی هەنگاوی دروست لەمەدا بەوە دەبێت شوێن ئەو دەقە شەرعیانە بکەوین کە لەوبارەوە هاتون و هەموویان پێکەوە وەربگرین، نەوەك بەشبەشیان بکەین و هەندێکی وەربگرین و واز لەهەندێکی تری بهێنین.

کۆکردنەوەی دەقەکان ئەنجامێکی ترمان پێ دەبەخشێت، ئەویش جوان لێتێگەیشتنی دەقەکانە لە سایەی کۆی دەقەکاندا، نەوەك لەسەر تێڕوانینێکی دیاریکراو بۆ تەنها دەقێك، کاتێك لەم فەرمایشتەی خوای گەورە تێدەگەین (لا إكراه في الدين) کە چاومان لەسەر ئەم ئایەتەش بێت (وَانْظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا لَنُحَرِّقَنَّهُ ثُمَّ لَنَنْسِفَنَّهُ فِي الْيَمِّ نَسْفًا)،[1] (بڕوانە بۆ پەروەردگارت کە بەردەوام پەرستشیت دەکرد، ئەبێت ئەو شوێنە بسووتێنین و دواتر خۆڵەمێشەکەی فڕێ دەدەینە ناو دەریا و بڵاوی ئەکەینەوە تا با بیبات)، هەروەها ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە سەرکۆنەی بەنوئیسرائیل دەکات و دەفەرموێت(كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَنْ مُنْكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ)،[2] (قەدەغە و رێگرییان نەئەکرد لە تاوانێك کە ئەنجامیان دەدا، بەراستی ئیشێکی زۆر خراپیان دەکرد)، هەروەها ئایەتی (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ)،[3] (کوڕ و کچی زیناکار، هەرکامیان سەد جەلدیان لێ بدەن).

---

(١) - طه: ٩٧.

(٢) - المائدة: ٧٩.

(٣) - النور: ٢.

هەڵەیە جیا لە دەقەکانی تر، دەقێك وەربگرین و بەتەنها لێی تێبگەین.

**دووەم:** گرنگە بۆ گەیشتن بە ڕوانینێکی دروستی شەرعیی لە بواری ئازادی لە ئیسلامدا، درك بەوە بکەین کە هۆکارێکی دەرەکی کاریگەر هەیە کە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەیە لە گومان خستنە سەر چەند چەمك و واتایەکی دیاریکراوی تایبەت بە ئازادی کە پێچەوانەی چەمك و واتای ئیسلامی بێت، ئەویش بریتیە لە پاڵنەری فشاری رۆشنبیریی لیبرالی رۆژئاوایی کە کاریگەری هەبووە لەسەر هەندێ پرۆژە و نووسینی ئیسلامی لە باسی ئازادیدا، ئەمەش تێڕوانینێکی شێواوی لەو بوارەدا لێ پەیدا بووە.

بۆیە گرنگە توێژەر مەشخەڵەکانی ئازادیی رۆژئاوایی و مەشخەڵی ئازادی ئیسلامیی لەیەك جیا بکەینەوە، ئەمەش واتای ئەوە ناگەیەنێت هەرچیەك لە بواری ئازادیدا باسکرا و سەرچاوەکەی رۆژئاوایی بوو، بەرپەرچ بدرێتەوە، نەخێر، بەڵکو مەبەست ئەوەیە مەشخەڵە شەرعییەکان شارەزا بین و دوور لە کارتێکەرە دەرەکییەکان لە سەرچاوە رەسەنەکانیەوە وێنایان بکەین، پاشان لە چەمك و واتای پێچەوانەی ئەم تێبگەین، ئینجا هونەری مامەڵە لەگەڵ واقیعدا بەکاربهێنین.

**سێیەم:** لە چەمك و واتا بنەڕەتیەکانی بواری ئازادیی ئیسلامی کە سەختە لە دەرەوەی ئیسلامدا بەدیبکەیت، بریتیە لە ئازادبوونی مرۆڤ لەوەی بەندەی پارە و سامان، یان ئارەزوو بێت، بە صەحیحی لە فەرموودەی پێغەمبەرمانەوە ﷺ هاتووە دەفەرموێت (**تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ وَعَبْدُ الْخَمِيصَةِ إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ وَإِنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ تَعِسَ وَانْتَكَسَ وَإِذَا شِيكَ فَلَا انْتَقَشَ**)،[١] (پیاوی پارەپەرست و پوولەکیی، داوەشێ و عەمری نەمێنێت، هەر خەریکی چڵکاوخواردن و شرەخۆرییە، بەندەیی خوای لەبیر نیە، دەڵێیت نۆکەری ئەڵقە بە گوێی قەیفە و گوروو نییە، هەر چاوی لە بەرژەوەندیی خۆیە، گوێ لە مستی نەوسنییە، بەشی بدرێت مەمنوونییە، بەشی نەدرێت لەگەڵ دوژمنە، داوەشێ و سوێی بێتەوە ئەگەر درکێکی تێ هەڵچەقێت، بە مووکێشیش دەرنەیەتەوە).[٢]

---

(١) - صحيح البخاري، الرقم ٢٨٨٧.

(٢) - دەقی وەرگێڕانی ئەم فەرموودەم لە وەرگێڕانی مامۆستا نووری فارس حەمەخان بۆ پوختەی صەحیحی بوخاریی وەرگرتووە. وەرگێڕ.

**چوارەم:** پێویستە لە پانتایی ئازادی لەنێو ئیسلامدا، ئەو ئازادیەی کەسێك بڕوای پێیەتی بۆ خۆی، جیابکەینەوە لەو ئازادیەی کە لەنێو خەڵکدا رایدەگەیەنێت، ئیسلام قبووڵی ئەوە دەکات بێباوەڕ لە خاکیدا هەبێت بەڵام بە چەند مەرجێك، لەوانە: رانەگەیاندنی تانەدان لە دین و بە ئاشکرا رانەگەیاندنی بێباوەڕیی.

کاتێك ئەم دوو حاڵەتە لەیەك جیانەکرێنەوە، ئەوکات شێواندن روودەدات، دەبینیت کەسی وا هەیە بۆ پێکەوەژیانی بێباوەڕان لەگەڵ موسڵمانان لە مێژووی ئیسلامیدا، دانانی چەند یاسایەك دەکات بە بەڵگە کە وادەکات بێباوەڕانیش وەك موسڵمانان بانگەواز بۆ پەیامی خۆیان بکەن و گومان لەسەر ئیسلام بورووژێنن، ئەمەش هەڵەیە، چونکە بیروباوەڕی خۆیان لەناو دەروونی خۆیان و لە کەشی داخراوی خۆیاندا شتێکە، راگەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئەو بیروباوەڕەشیان -کە ئیسلام نکووڵیی لێ دەکات- شتێکی ترە.

شتێکی تری لەم چەشنە: تێکەڵکردنی ئەو ئازادییەیە کە ئیسلام رەخساندوویەتی و مۆڵەتی داوە مرۆڤ لە چ بوارێکی دیندا پرسیاری بۆ دروست بوو، بپرسێت، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی گومانەکان لەنێو خەڵکدا و شێواندنی خاوێنیی بیروباوەڕ و دڵنیاییان.

وێنەی یەکەك لە قورئاندا رووبەرێکی فراوانی ئازادیی پێ بەخشراوە (وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي)،[١] (وە ئیبراهیم وتی پەروەردگارا نیشانم بدە چۆن مردووەکان زیندوو دەکەیتەوە؟ خوای گەورە فەرمووی مەگەر باوەڕت نەهێناوە؟ ئیبراهیم وتی با، بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر دڵم ئارام بگرێ)، هەروەها (فَإِنْ كُنْتَ فِي شَكٍّ مِمَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ فَاسْأَلِ الَّذِينَ يَقْرَءُونَ الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكَ)،[٢] (ئەگەر گومانت هەبوو لەوەی دامانبەزاندووە بۆ سەرت، ئەوە بپرسە لەوانەی پێش تۆ کتێبە ئاسمانیەکانی پێشوویان خوێندۆتەوە).

پێویستە دەرگای پرسیار و گفتگۆ و مشتومڕ لەبەردەم ئەوانەدا دانەخرێت کە پرسیاریان لا دروست بووە یان گومان و دوودڵییەکیان هەیە، بەڵام ئەگەر ئەو

---

(١) - البقرة: ٢٦٠.

(٢) - يونس: ٩٤.

گومان و دوودڵییە بچێتە چوارچێوەی ڕاگەیاندن و گومانخستنە سەر ئیسلام، ئەمە مونکەر و خراپەیەکە کە پێویستە لە ڕووی شەرعیەوە، بەری پێ بگیرێت.

ئەو خاڵانەی پێشوو، تەنها چەند تیشکێك بوون لەم بوارەدا، بۆیە بۆ زانیاریی زیاتر، ئاڕاستەتان دەکەم بۆ ئەم سەرچاوە سەرەدەمیانە:

**یەکەم:** کتێبی (فضاءات الحرية في الإسلام) لە نوسوینی سوڵتان عومێری کە (المركز العربي للدراسات الانسانيه) بەچاپی گەیاندووە.

**دووەم:** کتێبی (الحريات السياسية المعاضرة في ضوء فقه الصحابة) لە نووسینی فەهد عەجلان کە (المركز العربي للدراسات الانسانيه) بەچاپی گەیاندووە.

**سێیەم:** کتێبی (آفاق الحرية) لە نووسینی عەلی حەمزە عومەری، کە دار الأمة بەچاپی گەیاندووە.

**چوارەم:** کتێبی (الإستدلال الخاطئ بالقرآن والسنة على قضايا الحرية) لە نووسینی ئیبراهیم موحەممەد حقیل، کە (مركز البيان للبحوث و الدراسات) بەچاپی گەیاندووە.

**پێنجەم:** کتێبی (مفاهيم الحرية و تطبيقاتها في الدين و النفس والمال)لە نووسینی عەبدولعەزیز حومێدی.

## - کۆتـایی -

# ئیسـلام بەڕێوەیە...

سوپاس بۆ خوا لەسەرەتا و کۆتایشدا، صەلات و سەلامی خواش لەسەر موحەممەدی پێغەمبەری خوا.

# سه‌رچاوه‌كان


• الإجماع، أبو بكر محمد بن ابراهيم بن المنذر النيسابوري، صغير بن أحمد بن محمد حنيف أبو حماد.

• أحكام أهل الذمة، محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية أبو عبد الله، يوسف بن أحمد البكري أبو براء، أحمد بن توفيق العاروري أبو أحمد، رمادي للنشر - الدمام ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م. .

• الإحكام في أصول الأحكام، علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي أبو محمد أحمد محمد شاكر، دار الآفاق الجديدة - بيروت، ط ٢، ١٩٠٣ - ١٩٨٣.

• الاستيعاب في معرفة الأصحاب، يوسف عبد الله محمد عبد البر أبو عمر، محمد علي البجاوي، دار الجيل، ط١، ١٤١٢ هـ ١٩٩٢م.

• أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن، محمد الأمين بن محمد المختار الجكني الشنقيطي، مجمع الفقه الإسلامي بجدة.

• الاعتصام، إبراهيم بن موسى بن محمد النخي الغرناطي الشهير بالشاطبي سليم بن عبد الهلالي، دار ابن عفان - السعودية، ط١، ١٤١٢ هـ - ١٩٩٢م.

• إعلام الموقعين عن رب العالمين، محمد بن أبي بكر بن أيوب بن سعد شمس الدين ابن قيم الجوزية أبو عبد الله، مشهور بن حسن آل سلمان أبو عبيدة، دار ابن الجوزي، ط١، ١٤٢٣ هـ.

• الأعلام، خير الدين بن محمود بن محمد بن علي بن فارس، الزركلي الدمشقي، دار العلم للملايين، ط١٥، ٢٠٠٢م.

• أنوار التنزيل وأسرار التأويل المعروف بتفسير البيضاوي، ناصر الدين عبد الله بن عمر بن محمد الشيرازي الشافعي البيضاوي، محمد عبد الرحمن المرعشلي، دار إحياء التراث العربي - بيروت، ط١، ١٤١٨ هـ.

• اينشتاين والنسبية، مصطفى محمود . .

• البرهان في أصول الفقه، عبد الملك بن عبد الله بن يوسف الجويني أبو المعالي إمام الحرمين، عبد العظيم الديب، دولة قطر، ط١، ١٣٩٩ هـ.

• النظريات العلمية الحديثة مسيرتها الفكرية وأسلوب التفكير التغريبي في التعامل معها، دراسة نقدية، حسن الأسمري، طبعة تأصيل.

• التحبير شرح التحرير في أصول الفقه، علي بن سليمان المرداوي الحنبلي؟ علاء الدين أبو الحسن، مكتبة الرشد، ط١، ١٤٢١ هـ ٢٠٠٠م.

• التحرير والتنوير الحرير المعنى السديد وتنوير العقل الجديد من تفسير الكتاب المجيدة، محمد الطاهر بن محمد بن محمد الطاهر بن عاشور التونسي، الدار التونسية للنشر - تونس، ١٩٨٤ م.

• تفسير التحرير والتنوير، محمد الطاهر بن عاشور، الدار التونسية للنشر.

• تفسير الجلالين الميسر، جلال الدين المحلي، جلال الدين السيوطي - فخر الدين قباوة، ط١، ٢٠٠٣م. .

• تفسير القرآن العظيم، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي البصري الدمشقي، الهيثمي، العسقلاني، أحمد شاكر، الألباني، الأرناؤوط، المكتبة العصرية. .

• تفسير القرآن العظيم، إسماعيل بن عمر بن كثير الفرشي الدمشقي أبو الفداء عماد الدين، سامي بن محمد السلامة، دار طيبة، ط ٢، ١٩٢٠هـ - ١٩٩٩م.

• التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد، أبو عمر يوسف بن عبد الله بن محمد بن عبد البر بن عاصم النمري القرطبي، مصطفى بن أحمد العلوي، محمد عبد الكبير البكري، وزارة عموم الأوقاف والشؤون الإسلامية - المغرب،١٣٨٧ هـ .

• تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان، عبد الرحمن بن ناصر السعدي، مؤسسة الرسالة، ط١، ٢٠٠٠م


ASTANA

• جامع البيان عن تأويل آي القرآن (تفسير الطبري)، محمد بن جرير الطبري، عبد الله بن عبد المحسن التركي، دار هجر للطباعة والنشر

• جامع التحصيل في أحكام المراسيل، أبو سعيد بن خليل بن كيكلدي أبو سعيد العلائي، حمدي عبد المجيد السلفي، عالم الكتب - بيروت، ط٢، ١٤٠٧هـ –

• جامع بيان العلم وفضله، أبو عمر يوسف بن عبد الله بن محمد بن عبد البر بن عاصم النمري القرطبي، أبي الأشبال الزهيري، دار ابن الجوزي – المملكة العربية السعودية، ط١، ١٤١٤ هـ ١٩٩٤م.

• الجامع لأحكام القرآن (تفسير القرطبي)، محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي أبو عبد الله، عبد الله بن عبد المحسن التركى، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٤٢٧ هـ -

• جماع العلم، محمد بن إدريس الشافعي المطلبي، أحمد محمد شاكر، مكتبة ابن تيميه

• الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي، علي بن حسن، عبد العزيز بن إبراهيم، حمدان بن محمد. دار العاصمة - السعودية، ط ٢، ١٤١٩ هـ . ١٩٩٩م.

• الحاشية على شرح آداب العضد، الشيخ الصبان، (مخطوط).

• الحيدة والاعتذار في الرد على من قال بخلق القرآن، عبد العزيز بن يحيى بن عبد العزيز بن مسلم بن ميمون الكناني المكي الكناني، علي بن محمد بن ناصر الفقيهي، مكتبة العلوم والحكم - المدينة المنورة.

• الداء والدواء (الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي)، محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية أبو عبد الله، محمد أجمل الإصلاحي، زائد بن أحمد النشيري، مجمع الفقه الإسلامي بجدة، ط١، ١٩٢٩م.

• درء تعارض العقل والنقل، شيخ الإسلام تقي الدين أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني الدمشقي، محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، ط ٢، ١٤١١ هـ. ١٩٩١م.

• رحلة عقل، عمرو شريف، مكتبة الشرق الدولية - مصر، ط٤، ١٩٣٢م -

• روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني، شهاب الدين محمود بن عبد الله الحسيني الألوسي، إحياء التراث - بيروت، ط ٢.

• سنن ابن ماجة، محمد بن يزيد بن ماجة القزويني أبو عبد الله، شعيب الأرناؤوط وآخرون، دار الرسالة العالمية، ط١.

• سنن أبي داود، سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني، محمد ناصر الدين الألباني - مشهور بن حسن آل سلمان، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، ط١

• سنن الترمذي.

• شرح ابن عقيل على ألفية ابن مالك، ابن عقيل عبد الله بن عبد الرحمن العقيلي الهمداني المصري، محمد محيي الدين عبد الحميد، دار التراث - القاهرة، دار مصر للطباعة، سعيد جودة السحار وشركاه، ط ٢٠، ١٤٠٠ هـ . ١٩٨٠م

• شرح العقيدة الأصفهانية، تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن عبد السلام بن عبد الله بن أبي القاسم بن محمد ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي، محمد بن رياض الأحمد، المكتبة العصرية - بيروت، ط١، ١٤٢٥ هـ

• شرح العقيدة الطحاوية، ابن أبي العز، عبد الله بن عبد المحسن التركي، مؤسسة الرسالة، ط٢، ١٤١١ هـ . ١٩٩٠م.

• شرح صحيح البخاري، أبو الحسن علي بن خلف بن عبد الملك بن بطال القرطبي، ياسر بن إبراهيم - إبراهيم الصبيحي، مكتبة الرشد.

• الصاحبي في فقه اللغة العربية ومسائلها وسنن العرب في كلامها، أحمد بن فارس بن زكريا الرازي أبو الحسين، أحمد حسن بسج، دار الكتب العلمية، ط١، ١٤١٨هـ. ١٩٩٧م.

• صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل البخاري أبو عبد الله، دار ابن كثير - دمشق بيروت، ط ١. ٢٠٠٢م.

• صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج القشيري النيسابوري أبو الحسين، محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء الكتب العربية عيسى البابي الحلبي وشركاه.

• الطبقات الكبرى، أبو عبد الله محمد بن سعد بن منيع الهاشمي بالولاء، البصري، البغدادي المعروف بابن سعد، إحسان عباس، دار صادر - بيروت، ط١، ١٩٩٨م.

• العدة في أصول الفقه، أبو يعلى محمد بن الحسين بن محمد بن خلف ابن الغراء، أحمد بن علي بن سير المباركي، ط٣، ١٤١٠ هـ - ١٩٩٠م. .

• فتح الباري شرح صحيح البخاري، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي، ابن بازى دار الحديث - القاهرة ١٤٣٤ هـ ٢٠٠٤م.

• فتح القدير الجامع بين فني الرواية والدراية من علم التفسير (تفسير الشوكاني)، محمد بن علي الشوكاني، وزارة الأوقاف السعودية، دار المعرفة - بيروت، ط٤، ١٤٣١ هـ. ٢٠١٠م.

• الله ليس كذلك، زيجريدهونكه، غريب محمد غريب، دار الشروق، ط ٢،١٤١٧ هـ ١٩٩٦م.

• مجموع فتاوى شيخ الإسلام ابن تيميه، أحمد بن عبدالحليم بن تيميه، عامر الجزار -أنور الباز، دار الوفاء،

• مسائل الإمام أحمد روايه أبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني، سليمان بن الأشعث أبوداود، طارق بن عوض الله بن محمد أبومعاذ، مكتبة ابن تيمية، ط١، ١٤٢٠ هـ - ١٩٩٩ م.

• المستصفى من علم الأصول، أبوحامد الغزالي، حمزة بن زهير حافظ، شركة المدينة المنورة للطباعة.

• مسند أبي دواد الطيالسي، أبوداود سليمان بن داود بن الجارود الطيالسي البصري، محمد بن عبدالمحسن التركي، دار هجر – مصر، ط١، ١٤١٩ هـ - ١٩٩٩م.

ASTANA

• مسند الإمام أحمد بن حنبل، أبوعدبالله أحمد بن محمد بن حنبل بن هلال بن أسد الشيباني، شعيب الأرناؤوط – عادل مرشد و آخرون، مؤسسة الرسالة، ط١، ١٤٢١هـ - ٢٠٠١م.

• مسند الإمام أحمد بن حنبل، أحمد بن حنبل، أحمد معبد عبدالكريم، جمعية المكنز الإسلامي -دار المنهاج، ١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨م.

• مسند البزار (البحر الزخار)، أبوبكر أحمد بن عمرو بن عبدالخالق البزار، محفوظ الرحمن زين الله، عادل بن سعد، صبري عبدالخالق الشافعي، مكتبة العلوم والحكم -المدينة المنورة، ط١، ١٩٨٨م.

• المسودة في أصول الفقه، آل تيمية: مجد الدين أبوالبركتا عبدالسلام بن عبدالله بن الخضر.

• مصنف عبدالرزاق، عبدالرزاق بن همام الصنعاني أبوبكر، حبيب الرحمن الأعظمي، المجلس العلمي -جنوب أفريقيا، ط١، ١٣٩٠هـ - ١٩٧٠م.

• معرفة أنواع علوم الحديث (مقدمة ابن الصلاح)، عثمان بن عبدالرحمن أبوهمرو تقي الدين المعروف بابن الصلاح، نورالدين عتر، دار الفكر -سوريا، دارالفكر المعاصر -بيروت، ١٠٦هـ - ١٩٨٦م.

• المغني، موفق الدين أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة المقدسي الجماعيلي الدمشقي الصالحي الحنبلي، عبدالله بن عبدالمحسن التركي، عبدالفتاح محمد الحول، دار عالم الكتب للطباعة والنشر والتوزيع -الرياض، ط٣، ١٤١٧هـ - ١٩٩٧م.

• المغني، موفق الدين ابن قدامة، عبدالله بن عبدالمحسن التركي، عبدالفتاح الحلو، دار عالم الكتب، ط٣، ١٤١٧هـ - ١٩٩٧م.

• مفاتيح الغيب (تفسير الرازي)، فخرالدين الرازي، دار الفكر، ط١، ١٤٠١هـ - ١٩٨١م.

• مقدمة ابن خلدون، عبدالرحمن بن محمد بن خلدون ولي الدين، عبدالله محمد الدرويش، دار يعرب، ط١، ١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م.

• هل بشر الكتاب المقدس بمحمد صلى الله عليه وسلم؟، منقذ بن محمود السقار، دار الإسلام للنشر والتوزيع، ط١، ١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧م.

• وفيات الاعيان و أنباء أبناء الزمان، أبوالعباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر بن خلكان، إحسان عباس، دار صادر -بيروت.

• ينبوع الغواية الفكرية (غلبة المزاج الليبرالي .. ةأثره في تشكيل الفكر والتصورات)، عبدالله بن ثالح العجيري، مركز البحث والدراسات، مجلة البيان -الرياض، ط١، ١٤٣٤هـ.

# نـــاوەڕۆك

ASTANA

ASTANA

ASTANA




**لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، جەنگەکان بەشێکی دیار و بەرچاویان داگیرکردووەو پشکێکی گەورەی ئەو مێژووەیان بۆ خۆیان پچڕیوە، جەنگیش لەسەر دوو پایەی بنەڕەتیی وەستاوە: هێرش و بەرگریی، مرۆڤ لە هەردوو بارەکەدا پێویستیی بەپێناوەکانی جەنگ هەیە، بۆ هێرشبردن کۆمەڵێک چەکی بەکارهێناوەو بۆ بەرگریکردنیش کۆمەڵێک چەکی دی، دەبینین جەنگەکانیش تەنها لە جەنگی شمشێر و تیر و ڕم و چەکی ئاگریندا سنووردار نەبون، بەڵکو چەند مەیدانی دیکەی ململانێ هەن، هەندێ جار پێناوەکانی جەنگەکە زمان و پێنووسن، هەتا ئێستایش وەك هێرشێک بۆ سەر ئیسلام، گومانەکان بەرامبەر بە قورئان و پێغەمبەری ئیسلام و شەریعەتی خوا دەوروژێنرێن، ئەم شەپۆلانەی ئەمڕۆش کە هەن، کشانێکی نوێی ئەو جەنگە گوفتاریانەن کە هەرکەس بە قەڵغان خۆی بپارێزێت لێیان، رزگاری بووە، هەرکەسیش قەڵغانەکەی ورد و چڕ نەچنیبێت، تیرێک بەر قەڵغانەکەی دەکەوێت و لە درز و کەلێنێکەوە، قەڵغانەکە دەبڕێت و کەسەکە دەپێکێت.**

